

خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

● ڕۆمان

● **کۆچی هەورەتریشقە**

● نووسینی: مستەفا شێخە

● نەخشەسازیی ناوەوە و بەرگ: هێمن شێخە

● تابلۆی سەربەرگ: هێرو شێخە

● چاپی یەکەم: ٢٠١٤

● نرخ: (٣٠٠٠) دینار

● تیراژ: ١٠٠٠ دانە

● چاپخانە: موکریانی

● لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (١٦٦) ساڵی (٢٠١٤)ی پێ دراوە

زنجیرە کتێب (٨١١)

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

سڵاو ئەفسانە، من گەیشتمە تونجەلی. بەڵێنیم پێدابووی لەکوێ زانیم دەگیرسێمەوە، بە شێوەیەک ئاگادارت بکەمەوە.

لەسەر بەڵێنیی خۆمم. تا ئێستا لە کاغەز و قەڵەم بەملاوە دەستم وەهیچ رانەگەیشتووە. بەیانەیە و تازە خۆر کێوەکانی بەرانبەرمی ئەنگاوتووە. لە ماڵێکدا ئانیشکم وەسەر پەنجەرە داوە. بەرەو باشوور دەڕوانمە بەرزاییەکەی بەرانبەرم کە کۆمەڵە خانوویەکی لەوبەر دۆڵێک دابڕیوە. هەر دەڵێی شارێکی دیکە لەسەر پاناوکەکەی ئەوبەر خۆی دەگرێت و گەورە دەبێت. ڕووبارێک لەلای ڕاستمەوە بە قووڵایی دۆڵەکەدا دەخوشێت. درزی شکانی شووشەی پەنجەرەکەی بەردەمم وێنەی ئەودیو پەنجەرەکەی بە شێوەیەکی ئاسۆیی دوولەت کردووە. شەو درەنگان لە تاریکیدا گەیشتینە ئێرە. بەمن ڕا پێنج کەسین. هەر من کوردم. ئەوانیدیکە دوویان دەڵێن خەڵکی تارانین و دوو کوڕە جحێڵەی ئەفغانیشمان لەگەڵدان. یەکیان کۆسەیە و ئەوی دیکە ریشێکی نەرم و تەنکی هەیە. دوو تارانییەکە، ژنێک و پیاوێکن. دەڵێن ژن و مێردین. ژنەکە ناوی تەهمینەیە. کاتێک بەڕێگادا دەهاتین، لەژێر شەبەقی مانگەشەودا لێمدەبوو بەئەفسانە. ئەو کاتەی لە ماڵەکەی گەڕەکی ئیسلامئاباد لێک جیا بووینەوە، هەر لەو گەڕەکە منیان بردە ماڵێکی دیکە و ئەم چوار کەسەش لەوێ بوون.

ئەو کەسەی لەسەر سنوور لە کابرای دیوی ئێران وەریگرتین، دەڵێت دەگەڕێمەوە و چەند کەسی دیکە وەردەگرم. بەڵێنی پێداوم ئەم نامەیە بداتە قاچاخچییەکەی ئەودیو و تۆش لە گەڕەکی ئیسلامئابادی ورمێ، هەر لەوشوێنەی لێک دابڕاین، وەریبگری. ئەو ماڵە ژمارە تەلەفۆنی تۆیان لایە و تەلەفۆنت بۆ دەکەن.

ڕەنگە ئەم نامەیە لە نێو تۆڕی قاچاخچییەکاندا ون بێت و ئەوەی نووسیومە هەرگیز نەیخوێنیەوە. سەیر دەبێت نەگاتە دەستی تۆ و لەدەست منیش بچێت. خۆت دەزانی من ئەوەندە کوێرزەینم، ئەوەی دەینووسم، دواتر زوو لە مێشکم پاک دەبێتەوە. لەوەش دەترسم تەنیا من ئەوەندە فەرامۆشکار بم، بۆیە بەردەوام ئەوا سەرگەردانم. هەرچۆنێک بێت، هەر دەینووسم. نازانم، دەشترسم ئەوەی بەتەمای نووسینیم، هەمووی نەچێتە نێو نامەکە و پاراگراف و دێڕەکان زۆر شپرێو و بە شێواوی بەدەستت بگەن. من لە پاراگراف و دێڕە شێواو و ئاڵۆزەکانیش بێزارم. دڵم بەوە خۆشە، تۆ هەمیشە دێڕ و ڕستە ناتەواوەکان بەوپەڕی لێهاتووییەوە دەبەیەوە سەریەک و دەیانکەیەوە گێڕانەوەیەکی بەردەوام. خۆزگە ئەم نامەیەی منیش بەمجۆرە بخوێنیەوە. هەرچۆنێک بێت، هیوادارم بگاتە دەستت.

لێرە دەڵێن، هەر ئەمڕۆ دەبێ خۆمان بگەیەنینە نووسینگەی یووئێن. قاچاخچییەکان، دوانیوەڕۆ بەجێمان دێڵن. دەڵێن کە کەوتینە ژێر چاوەدێریی ئەم ڕێکخراوەی پەنابەرانەوە، هەتا کاتێکی نادیار دەبێ چاوەڕوانی وەڵام بین. دوای گێرە و کێشەیەکی زۆر، ڕەنگە وڵاتێکی سێیەم وەک پەنابەر وەرمان بگرێت. من پێم سەیرە بۆچی لەم وڵاتە پان و بەرینەدا ئێمەیان هێنایە ئەم شارە؟ یەکێک لە کوڕە ئەفغانییەکان دەڵێت، ئەمە فێڵی قاچاخچییەکانە. ئەوانەی دەیانهێنن بۆ ئێرە، بە نێو هەموو شارەکانی ئەم وڵاتەدا دابەشیان دەکەن. ئەم کوڕە ئەفغانییە دەڵێ ئەوەندە بە تاسەی ڕۆیشتنە، لەبارەی هەموو شتێکەوە ورد ورد پرسیویەتی. هەرچۆنێک بێت دوای خۆناساندن و وەرگیرانمان لەلای یووئێن، دەبێ لە چاوەڕوانیی وەڵامی وڵاتی سێیەم دابین.

لە نێو فڕۆکەدا بەرەو وڵاتی سێیەم دەڕۆم. تۆ بڵێی مەودای نێوان ئێرە و ئەوێ چەند سەعاتە ڕێگا بێت؟ دەترسم لەوێش تووشی ئەفسانەیەکی دیکە بم. ئەفسانەی دیکە؟ ئەفسانە لەدوای ئەفسانە. ئەفسانەیەک جێدێڵم و یەکی دیکە دەردەکەوێت. بێ ئەوەی بەتەواوی لە ئەفسانەیەک دابڕێم، یەکی دیکە دێتەوە نێو ژیانم. سێبەری ئەفسانەکان هەموو کون و کەلەبەرێکم لێ داگیر دەکەن. هەست دەکەم هەمیشە لە سێبەردا دەژیم. سێبەری ئەفسانە!

دوگمەی ئەم عەبا فشەت بکەوە، ئەفسانە! دەڵێی باڵی شەمشەمە کوێرەیە! کاتێک شاقەلەکانی وێکدێنی، وادەزانم لەشت ڕێک دەگوشێت. کاتێکیش بڵاویان دەکەیەوە، باڵان لێکدەکەیەوە و ئەم نێوە هەموو دادەپۆشی. بیکەوە با بکەومە بەر سێبەری. ئەوەندەی لەژێر سێبەری تۆدا دەحەسێمەوە، ڕەنگە سێبەری هیچ درەخت و ڕەوەز و بانیژە و هەیوانی هیچ سابات و خانوویەک ئەوا نەمحەسێننەوە.

لەژێر سێبەری فێنکی ئەفسانەدا خەیاڵ هەڵمدەگرێت. دەترسم لەژێر ئەم سێبەرە فێنکەدا ئەوەندەی دیکە سێبەری دڕدۆنگی و دڵەڕاوکێی زەمەنی نەهاتوو بەسەرمدا زاڵ بێت. لەژێر ئەم سێبەرەشدا دەترسم. ترسی نەمانی سێبەر هەڵمدەگرێت. دەترسم سێبەرەکەت نەمێنێت و لێم دوور بکەویەوە. دەترسم باڵەکانت داخەیەوە و لێم دوور بکەویەوە. ئەوکات هەست دەکەم لە بیابانێکی وشکارۆ و قاقڕ دام و ئەم خەمە دامدەگرێت نەکا شاقەلی عەبا فشەکەت ببن بە دووباڵی چەترئاسا و ئەوەندە بەرزت بکەنەوە بە نێوان هەسارە دوورەکاندا ئاوابی و بۆ هەمیشە لە سێبەرت بێبەری بم.

لە ڕۆیشتن بەرەو وڵاتی سێیەم پەشیمان دەبمەوە. پێمخۆشە فڕۆکە لەم ئاسمانە بەرین و بێ‌لەمپەر و کۆسپەدا بەرەو تۆ بسووڕێتەوە. دەنگی میوانداری فڕۆکە ڕامپەڕێنێت و بڵێت، فڕۆکە بە ئارامی بەرەو شاری ئەفسانە سنوور دەبەزێنێت. ئێستا کە بەرز بوومەتەوە، دەزانم ئەم ئاسمانەش یەکپارچە نییە. هەر وڵاتێک لە خوارەوەڕا بەشێکی بۆ خۆی دابڕیوە. خۆزگە لەسەر ئەم فڕۆکەیەڕا شاری گێلاساوام لێ دەرکەوتبا.

بەسەر ماڵی ئێوەدا فڕییام. لەبەرزایی سەر ماڵتانەوە جارێکی دیکە تۆم لەسەر هەیوانی نهومی سەرەوەی ماڵەکەتانەوە دیتبایە.

ئەوەندەی لە نهومی ژێرەوەی ماڵەکەتان دابووم، نەمدەتوانی لە سەرەوەڕا بەرهەیوانی نهومی دووهەم ببینم. لە خوارەوە لە میچی هەیوانەکەم دەڕوانی. کاتێک دەنگی تۆم لە سەرەوە دەبیست، سەرم بەرز دەکردەوە و تەنیا میچە بە گێچ نەخشێنراوەکەم دەدیت. نەخش و نیگاری دەوری لامپی بنمیچەکە لە خەیاڵمدا دەشێوا و ڕوخساری تۆی لێ دروست دەبوو. خۆزگەم دەخواست لە سەربانی نهومی سەروو، لەسەرزگ ڕاکشابام و چنگم لە لێوەسوانە قایم کردبا و تەنیا دووچاوم تا پشت لووتم لەسواندەوە تێپەڕاندبا. بێئەوەی خۆت هەستت پێکردبایە، لەسەرەوەڕا لێم ڕوانیبای. بە سەر هێڵی دابەشکردنی پرچتدا لە تەوقە سەرت بەرەو پێشەوەت، بەرزایی سینەت ڕێگە نادات هیچی دیکە ببینم و لە دواوەش بارستایی پرچت لەودیو بەرزایی شانتدا بەرەو کوڵمەی ڕانەکانت ئاوا بووە. ئەم گۆشە نیگای ڕوانینە لەزەتێکی تایبەت بە خۆی هەیە.

دوودڵم، نازانم چیم بەسەر دێت. دڵم پێیخۆشە جارێ هەر لێرە بمێنمەوە. هەر دەڵێی لێرە شتێکی نادیاری ئەفسانەئاسا بەخۆیەوە دەمبەستێتەوە. بەدرێژایی ئەم دووشەو و ڕۆژەی لەگەڵ تەهمینە لە ڕێگادا بووم، هەوڵمداوە ئەو بکەوێتە دواوەم. پێم خۆش نەبوو چاوم بە ڕوخساری بکەوێت. ئەوەندەی تریفەی مانگەشەو لاجانگ و گۆناکانی دەنگاوت، ئەفسانەم دەهاتەوە بەر چاوان. ئەوکاتەی ڕاستەوخۆ لە چاوەکانیم دەڕوانی، هەستم دەکرد وادەزانێت من لە هەر چوار کەسەکەی دیکە باشتر خۆم لەگەڵ بارودۆخی ئەم سەفەرەدا گونجاندووە. چاوەکانی داواکاریی یارمەتی خواستنیان لێدەباری. خێرا لێم دەبوو بە ئەفسانە. دەنگی بەشێک لە سۆزی دەنگی ئەفسانەی تێدابوو. هەر لەبەر ئەوەبوو جارجار پەشیمان دەبوومەوە بیدوێنم. ئەم حاڵەتە دەیخستمەوە بەر



سیحری ئەفسانە. هێندێک جاریش پێم خۆش نەبوو دەنگی ببیسم. کاتێک دەیبردمەوە دنیای ئەفسانەکان، دوای وەخۆهاتنەوە غەمێکی قووڵ دایدەگرتم. ئەو کاتانە بەزەیی و بێزاریم لە ڕوخساری تەهمینەدا بەدی دەکرد. ئەو ئاگای لەدەروونی من نەبوو. پێموایە وایدەزانی جوانییەکەی سەرنجی ڕاکێشاوم و بە هیوام بەشێوەیەک بیگەمێ. جاروبار لێی نزیک دەبوومەوە، بەڵام لێی دەترسام. دەترسام ئەویش خاڵی هاوبەشی ئەفسانەکانی زۆر بەخەستی تێدابێت و ئەم خاڵە هاوبەشانە زیاد بکەن. خۆشەویستیی ئەفسانەکان وەک کەمەند هاویشتراونەتە دەوری دڵم و وردە تەقەڵیان لە مێشکم داوە. تا خۆم دەبزێوم، گرێکانیان پەیتتر دەبێت و تەقەڵەکانیش توندتر دەبن. دڵ و مێشکم دابڕدابڕ دەکەن. باشە بۆ هەر ئەفسانەیەک من تووشی دەبم لەوپەڕی جوانیدایە؟ ڕەنگە واش نەبێت و تەنیا ئەم چاوانەی من ئەفسانەکانیان ئەوەندە پێ جوان بێت.

نازانم ئەوەی دەیڵێم چەندەی دەبێتە پیت و وشە و ڕستە و لە نووکی قەڵەمەکەمەوە دەتکێتەوە. تۆ باش دەزانی من هەمیشە وام. ئەو بابەتەی دەمهەوێ باسی بکەم، زۆرجار دەبێتە پەڕاوێز و پەڕاوێزەکان بەنۆرە سینگیان دەدەنە بەرەوە و شان وەبەر بابەتی سەرەکی دەدەن و دەیخەنەوە پەڕاوێزەوە. ئەوەی سوکناییەکم دەداتێ، تەنیا تێکەڵبوونەوەی خۆم و ئەفسانەیە. لەبیرتە باسی پەڕاوێزت کرد؟ لە پەڕاوێزی قسەکانی تۆدا هەر بیرم لە یەکەم ئەفسانەی ژیانم دەکردەوە. ئەویان چەندی بڵێی جوان و ڕێک و لەبار بوو، بەڵام تۆ ئەویشت خستە پەڕاوێزەوە. ئێستاشی لەگەڵدابێت. هەرچییەک شک دەبەم لە پەڕاوێزی تۆدایە. زەحمەتە تۆ جێگە بۆ هیچ پەڕاوێزێکی دیکەچۆڵ بکەی.

* * *

تەهمینە و توورەج دەڵێی ماری ئاشقەوماشقەن، دەرفەتێکیان دەست کەوێت لێک دەهاڵێن.

ئەوکاتەی بەرەو سنوور سواری ماشێن بووین، تەهمینە بە توورەج پێکەنی. توورەج  ویستی ڕستەیەکی کوردی بڵێتەوە. دیاربوو ماوەیەک بوو لەبەرخۆیەوە دەیگوتەوە و لەبەری دەکرد. پێموابێ هیچ لەماناکەشی نەدەگەیشت. دیاربوو هەر لەم سەفەرەدا فێری ببوو. پێکەنینەکەی تەهمینە ئەو نەرمە بزەیەی بیرخستمەوە کە یەکەم جار تۆ بە کوردی گوتنەکەم پێکەنی. کوردی گوتنەکەی من وەک هی توورەج نەبوو. من کوردیم دەزانی، بەڵام لە هێندێک وشەدا دەمامەوە. لە دەربڕینی دەنگەکانیشدا کێشەم هەبوو. پێکەنینەکەی تۆش تەواو وەک هی تەهمینە نەبوو. وەبزانم تەهمینە هەر بەوە پێدەکەنی توورەج زمانێکی دیکە دەڵێت کە هیچیان تێیناگەن، بەڵام تۆ بە کوردی گوتنە سەقەتەکەی من پێکەنیبووی. ئێستا کە سەیری ڕستەکانی ئەم نامەیە بکەی، دەزانی لەخۆم ڕادەبینم وەک ئەفسانەی خۆم بەڕەوانی کوردی بڵێم. نووسینەکەشم شان لەشانی نووسینی تۆ دەدات. سەیری کە من چەندە تێکەڵم، خۆ هێشتا ڕستەیەکم لەسەر ئەم کاغەزە نەنووسیوە و دەڵێم ئێستا کە سەیری ئەم رستانە بکەی.

تەهمینە بەتوورەج پێکەنی و لێوەکانی بەسەر ددانەکانیدا ڕێکگوشین. سەرکۆنەی سەدەفە سپییەکانی نێودەمی کرد. هێنامیەوە لای تۆ، ئەوکاتەی لە ئیدارەی کشتوکاڵ لەپشت کامپیوتێرەکە دانیشتبووی و گوتت فەرموو؟

– شکایەتم کردووە. منیان بۆ ئێرە ناردووە. دەڵێن دەبی لەم ئیدارەیە جەوابی نامەی دادگا بدرێتەوە.

– سکاڵاکەت بەناوی کێیە؟

– بەلێ؟ باش موتەوەجێهـ نەبووم.

– شکایەتەکەت بە ناوی کێیە؟

– بە ناوی مەن، ئیزا...



– ناوی باوکت؟

– میرۆ...

– بابەتی شکایەتەکەت چییە؟

– مەوزووعی شکایەتەکەم؟

– بەڵێ.

– قەتعە زەمینێکی کەشاوەرزییە، میراسی بابامە، غەسبیان کردووە. دەمهەوێ پەسی بگرمەوە.

– بچووە ژووری رەئیس، بزانە چیت پێدەڵێت.

ڕیزی ددانە سەدەفیەکانت بردیانمەوە لای ئەفسانەی مەش بایرام[١].

ئەفسانەی مەش بایرام، وێردی سەرزمانی کوڕوکاڵی گەڕەکی نەوباری تەورێزە. ماوەیەکە لە سووچێکی مەیدانی مەقسوودیە خۆم دەگێزرێنم و چاوەڕوانی دەبم تا لەوێوە بەرەوماڵ بێتەوە. یەکەم جار کە دوای ئەفسانە کەوتم، لە تەنیشت تاکە دووکانی ئەوسەر کۆڵانەکەمان، خۆی بە دەروازەیەکی بچووکی دوودەری داکرد. چوومە نێو دووکانەکە و داوای قەڵەمێکی ڕەشم کرد. دەرگایەک لە سووچی دواوەی کابرای دووکاندار کرایەوە. ژنێکی پانوپۆڕ، خۆی لە چارشێوێکی تەخت سپیی بە گوڵی وردی ڕەشەوە وەرپێچاوە.

– مەش بایرام، ئەفسانە پێتشتدی. نەهارنی یێیمسەن؟[٢]

ئەو ساتە وەختە بوو من و ئەفسانە و مەش بایرامی بەیەکەوە گرێدا. هەمووڕۆژێک لە سووچی مەیدانی مەقسوودیە خۆم دەخافڵێنم. ئەفسانە بەوێدا ڕادەبرێت. یەکسەر بە بیانوویەک خۆم بە دووکانەکەدا دەکەم. ئەوکاتانەی لەبەر میزی ناو دووکانەکەدا رادەوەستم، بەڕواڵەت گوێم

١– مەش بایرام کورتکراوەی مەشهەدی بایرامە. لە ئێران ئەو موسوڵمانە شیعانەی لە شاری مەشهەد زیارەتی مەرقەدی ئیمام رەزا، ئیمامی هەشتەمی شیعانیان کردووە، پێیان دەڵێن مەشهەدی. وەک ئەوە وایە کەسێک چووبێتە حەج و پێی بڵێن حاجی.

٢– مەش بایرام، ئەفسانە گەیشتەوە، نانی نیوەڕۆکەت ناخۆی؟

لە مەش بایرامە و دڵیشم لەسەر درزی دەرگا بچووکەکەی سووچی دواوەی دووکانەکە لێدەدات. خۆم لێرە و دڵ لەوێ. بەحاڵ گوێم لە ترپەی دەبێت. خستوومەتە کەمینەوە. ئاخۆ کەی ئەفسانە بەسەریدا دەکەوێت؟ دڵم لەوێ لە کەمینی ئەفسانەدا لێدەدات. کەمێک دێمەوە سەرخۆ و هەست بە لێدانی توندی دڵم دەکەم. ئەم ترسە دامدەگرێت، دووکاندارەکە هەست بەم لێدانە خێرایە بکات. ئەوکاتەی قەڵەمە ڕەشەکە دەخەمە نێو گیرفانی لای چەپی سەر سینەی کراسەکەمەوە، بە چاو تەکانی لێواری گیرفانی کراسەکەم دەبینم بەهۆی ترپەی دڵمەوە دەلەرێتەوە. دووکاندارەکە بە بزەوە دەڕوانێتە ڕوخسارم و پێدەکەنێت. دەڵێی هەستی بە هەناسەبڕکێم کردووە. بە پێکەنینەوە دەمدوێنێت و هەست دەکەم ئەویش لە هاودەنگێک دەگەڕێت. من هەوڵ دەدەم زوو لەم دۆخە دەرباز بم و ئەویش مەودای ڕۆیشتنم پێنادات. هۆشم زۆر لە قسەکانی نییە. وەژوورکەوتنی مشتەرییەک دەکەمە دەرفەت و بە سووکە ماڵئاواییەکەوە دەچمە دەرەوە.

یەکەم سەردانی ئەم دووکانە وای لێکردم هەرجارەی بە بیانوویەک خۆم بە دووکانی مەش بایرامدا بکەم. ئەو بیرەوەرییەکانیم بۆ دەگێڕێتەوە و منیش دڵم لەبەر دەرگای سووچی دواوەی دووکانەکەیدا لێدەدات و گوێ بۆ بیرەوەرییەکانی شل دەکەم. گوێچکەم لێرە و دڵم لەوێ. ئەفسانە خەریکە پارچە پارچەم دەکات. جاری وایە گوێچکەم بۆ بیستنی خشپەی پێی ئەفسانە لەودیو دەرگاکەوە، دەچێتە سەر درزی دەرگا و هێندێک جاریش گوێچکەم دێتەوە لای مەش بایرام و دڵم دەچێتە ئەوێ. چاوەکانیشم بەردەوام لەنێوان ڕوخساری مەش بایرام و دەرگاکەی پشتەوەیدا لە هاتووچۆدان. ماوەیەک دواتر زانیم ئەفسانە هەڵیوەشاندووم و ئازای بەدەنی لەبەریەک بردووم. پێموایە ئەندامەکانی لەشم لەسەر جەستەم قەرار ناگرن و بە دوای ئەفسانەدا لێک دادەبڕێن.



مەش بایرام بەشێکی زۆری بیرەوەرییەکانی چەند جار بۆ گێڕاومەتەوە. لەم کاتانەدا زیاتر هۆشم لای ئەفسانەیە. ئێستا ڕەنگە زیاتر لەنیوەی ژیاننامەی مەش بایرامم لەبەربێت. ئێستا دەتوانم وەک مەش بایرام لە سەرەتای ڕۆیشتنیەوە بۆ سەربازی و مانەوەی یەکجاریی لە ڕیزی چەکدارانی ژاندرمەری و زەماوەندی لەگەڵ عەمە جەیراندا بگێڕمەوە. تا دەگاتە ئەو کاتەی دوای شۆڕشی ساڵی١٣٥٧ خانەنشینیان کردووە، هەموویم لەبەرە. ئاگام لەو کێشەیەش هەیە کە دوای دەست بەکاربوونی ئەم دووکانە لەگەڵ شارەوانیدا تووشی هاتووە. لە هەمووی زیاتر گوێم داوەتە چۆنیەتیی لەدایکبوونی ئەفسانە. بەدڵ گوێم بۆ بەسەرهاتی لەدایکبوون و گەورەبوونی تاقانە کچەی مەش بایرام شل کردووە. ئێستا دەزانم ئەفسانە چۆن بۆ شیر گریاوە و تەنانەت کام کەیک و بسکویتیش بە دڵی بووە. دەزانم تا ئێستا چەند جار نەخۆش کەوتووە و تەنانەت بە دەم کام پەرستار و دکتۆریشەوە خەنیوەتەوە.

ئەفسانە، ئەگەر دەستم وێتڕابگات تەواوی ئەو کەیک و بسکویت و خۆراکانەت بۆ دەکڕم و پێشانتیان دەدەم، با تێبگەی چەندەم خۆش دەوێی. با خۆشەویستیی من بۆ تۆ، بۆ یەکەم چرکەی لەدایکبوونت بگەڕێتەوە.

دەبێ لە مەیدانەکەدا ڕاست بەرەوڕووی بچم. لەپڕێکدا نیگای دەقۆزمەوە و بە بزە شیرینەکەیەوە دەزانم مچوڕکی برۆی ڕاستم کاری سەدان نامە و ئیما و ئاماژەی کردووە.

نەمگوت، شانست دەیگرێت و سەردەکەوی، ڕەزا!؟ ئەوەش ئەفسانە خانم! خستمە داوەوە. نانا ئەفسانە، من کەوتمە داوی تۆوە. خۆشە هەردووکمان کەوتبینە داوی یەکترەوە. هەر من داوی خۆم توند دەکەم و تۆش داوی خۆت زیاتر ڕاکێشە، با هەرگیز لێک نەبینەوە.

بەپەلە خۆم دەگەیەنمە بەر دووکان. ئاغام لەبەرانبەر مەش بایرامدا

خۆی هاویشتۆتە سەر ئانیشکی ڕاستی. دەسڵەمێمەوە.

مەش بایرام، ئاماژەی بۆ من کرد و ئاغام[1] ئاوڕی دایەوە و بانگی کردم. ئەو کەلوپەلانەی کڕیبوونی، پێیدا ناردمەوە. لە ڕێگای نێوان دووکانی مەش بایرامەوە تا دەگەمەوە ماڵ، لە نێو ترس و دڵەڕاوکێدا هەنگاو دەنێم.

ئاخۆ دوای برۆ هەڵتەکاندنەکەم، ئەفسانە دەرگای سووچی دووکانەکە ناکاتەوە؟ تۆ بڵێی ئاغام لای مەش بایرام باسی من نەکات؟ بڵێی مەش بایرام دوای ئەم ڕۆژە وەک جارانی پێشوو بەگەرمی بمدوێنێت؟ ئەگەر ئەفسانە لە دەرگای نێوان ماڵ و دووکانەوە دەرکەوێت، بڵێی بە جلی دەرەوە بێت یان جلی ماڵەوەی لەبەر دابێت؟ بڵێی ئەو قژە کاڵانەی لەژێر لەچکەکەدا شاردبێتەوە یان پەخشانی سەر لەشی ناسکی کردبێ؟ دەترسم وەک دایکی چارشێوێکی گوڵگوڵی لەخۆی وەرپێچێت و بە دەنگێکی نزم باوکی بۆ ژوورەوە بانگ بکاتەوە. دەبوایە وەک هەموو جارێک کە لەم نزیکانە تووشی ئاغام دەبووم، لەماڵەوە بمێنمەوە تا خۆی دێتەوە.

دوای ئەوەی شتەکانم دایە دەست مامان[2]، چوومە لای ئاکواریۆمەکە و سەیری دوو ماسییە سوورەکەم کرد. ماسییەکان تەقڵە لێدەدەن و لە ژێرەوەی ئاوەکەوە خۆیان هەڵدەدەنە سەرەوە. سەیری کە، ئەم ئاوەچەندە روونە!؟ هەموو خۆراکی سەر ئاوەکە کۆدەکەنەوە. بڵێی ماسییەکان ئەوەندە برسیان بێت یان دەیانەوێت لەنێو ئەم ئاوە ڕوونەدا هیچ لەمپەرێک لە بەینیاندا نەمێنێت؟

خۆزگەم بەخۆتان ماسییەکان! تەنیا ئەم ئاوە ڕوون و پاکژە کەوتۆتە

١– لە نێو فارسەکان و لە ئێران وشەی ئاغا جگە لە ناوێک بۆ خاوەن ملّکەکان وەک بەڕێز واتا لە جێگەی «سەید»ی عەرەبیش کەڵکی ل یۆەردەگیرێت و قوتابیانیش بە ماموستا پیاوەکان دەڵێن ئاغا و زۆر لە منداڵەکانیش بە باوکی خۆیان دەڵێن ئاغا.

٢– لە نێو فارس و تورکەکاندا منداڵان زیاتر بە دایکی خۆیان دەڵێن مامان.



نێوانتانەوە. ئاو ئەوەندە نەرم و ڕوون و ڕەوانە، ئەوکاتانەی دەتانهەوێ خۆ لێک بدەن، شەق دەبات و ڕێگەتان بۆ دەکاتەوە. خۆزگە دەرگاکەی سووچی دووکانی مەش بایرام ئاو بووایە. خۆزگە دووکانەکە و ماڵەکە و دیوارەکان و هەموو تەورێز دەریا بان. من و ئەفسانە لە مەیدانی مەقسوودییەوە، بە مەلەباسکە و پێمەلە بەدوای یەکتردا ڕامان کردبایە و وەک ئەم دوو ماسییە دەممان لە دەمی یەکتر نابایە. دەنگی ئاغام لە داڵانەکەوە بەرز بۆوە:

– ئیزا شێیلاری گەتیێت؟[1]

مامان، لە ئاشپەزخانەوە بەرەوپیری چوو، بە پەشۆکاوی خۆم گەیاندە بەر دەرگا و سڵاوم کرد.

– سەلام. باش بوو هاتی بۆلای دووکانی مەش بایرام. قسەمان لێ خۆش داهاتبوو. تۆ نەبای، وەدرەنگ دەکەوتم. بیانوو دەکەوتە دەست مامانت و ئەمشەویش بێشیو خەو دەیبردینەوە. مەش بایرام تاریفی دەکردی. دەیگوت «کوڕێکی بەڕێزە، تا ئەم دواییانە لەم دەوروبەرانە نەمدیتبوو. زۆر بە ئەدەبە».

ئاغام بە تورکییەکی ئازەریی پەتی قسە دەکات. تۆ وات لێکردم من بە کوردییەکی پەتی بیگێڕمەوە. ئای ئەفسانە چۆن ئەم زمانەخۆشەی ئەفسانەی مەش بایرامت خستە پەراوێزەوە.

بەیانییەکەی دیسان خۆم گەیاندەوە مەیدانی مەقسوودییە. ئەفسانە لەدوورەوە پێیەوە دیارە چاوەڕوانمە. کاتێک لێم نزیک بۆوە، هەستم کرد ڕەوتی جارانی نەماوە و پێیەکانی تێکدەهاڵێن. خۆمان پێ ڕانەگیرا و نیگاکانمان یەکتریان ئەنگاوت و تێکهاڵان. هەنگاوەکانم تا بەردەرگای دووکانم دەبەن. بێئەوەی دەرفەتی بیرکردنەوەم پێبدەن، دەمبەنەوە بەرمیزەکەی بەردەم مەش بایرام. دێمەوە سەرخۆم و سڵاو دەکەم.

١– ڕەزا شتەکانی هێنایەوە؟

– سەلام، ئیزا جان چۆنی؟

پێم سەیرە، مەش بایرام بە کوردی قسە دەکات. دەترسم. پێموایە ئاغام دوێنێ ئێوارێ بۆی لەبنی کوولەکە داوە و ئێستا ئەویش وەک دەروجیرانی کۆلانی خۆمان، دەڵێت ئیزا بیژی کوڕی سەفەرعەلی بولۆت ئۆغلوو نییە.

مەش بایرام لەگەڵ جیرەی دەرگاکەی پشتەوەی ئاوڕی دایە دواوە ورووی کردەوە لای من. شەڵوارە ستریچەکەی بە ڕانی لووسیدا هەڵچووە. ڕانێکی لەم دیوەی دەرگایە و باڵا بەرزەکەی کەمێک بەرەو پێشەوە نەویوە. نیوەی سەرووی لاسینگی بەدیارەوەیە و لەنێو سینەبەندەکەیدا حەجمینی لێبڕاوە. دەستم لە مێزەکەی نێوان خۆم و مەش بایرام گیردەکەم. مچوڕکێک لە بەری پێمەوە دێت و تاڵە موویەکانی تەوقی سەرم قرژتر دەکات. بە یارمەتیی دەستەکانم سەنگایی خۆم بە مێزەکەوە دەپارێزم. دەرگاکە نیوەی بەدەرەوەی ئەفسانە هەڵدەلووشێتەوە. مەش بایرام ئاوڕ دەداتەوە لای دەرگاکەی پشتەوە و بە دەنگێکی نەوی دەست پێدەکات:

– هەی بەسی هەمرم بەسی
دووانت کوشتەوە مەیەکەوە بەسی
بەسی لەوبەر پەنجەرە جوانە تەشی دەریسی...

– مەش بایرام ئەم گۆرانییە خۆشە لە کوێ فێربوویە؟

– «کورە وەرە بۆت بگێرم. مەن ئەفسەری ژاندارمەری بووم. لە کوردستان لە دەهاتێکی نیو مەنگوران رەئیسی پاسگاهـ بووم. ئای یادت بەخێر بەسی! نازانی بەسی چەندجوان بوو! مێردەکەی ناوی هەسەنەڕەش بوو. بەسی ئەوەندە جوان بوو، خەلکی ئەوی هامووسی بۆی شێت دەبوونەوە. پێیان دەگووتەوە بەسەلووسی. سینەی ئەوەندە ساف و لووس بوو. زۆر جوان»!



چاوم لە درزی دەرگاکە دەبڕم. ئەفسانە بە هێواشی لەو دیوڕا دەرگاکە دەقەلاشێتەوە.

«مێردەکەی بەسەلووسی گاچاخچی بوو. لە ئیراگ سابوون و چای دەهیناوە. دەیبردەوە لە شار دەیفرۆشتەوە».

ئەفسانە دەستی بە سەردەرانەی دەرگاکەوە دەگرێت. لایەکی سینەی کەمێک بەرزتر دەبێتەوە. ئەژنۆی ڕاستی هێندێک دەداتە بەرەوە.

«بەری دەرگەم بە هەسەنەڕەش گرتەوە. گوتمەوە ئەتوو گاچاخچیتی دەکەیەوە. لەزیندانت دەکەمەوە. بەسی هاتە دەرەوە. گوتی:

– ئاغای رەیس فەرموو، دانیشە چایەکی وەخۆ.

هەسەنەرەش زمانی تێک دەهالاوە و لال دەبۆوە. گوتم باشە دەی، گەیدی ناکا، چایەکی دەخۆمەوە. بە هەسەنم گوتەوە بیرۆ لە پاسگاهـ سەرباز گەلەندەری بانگی بکەوە».

ئەفسانە دەڵێی بە تەمایە بە قەڵەمبازێک خۆی باوێتە سەر مێزەکەی نێوان من و باوکی. باوەشی پێدادەکەم و دەیهێنمە خوارەوە و بە مێزەکەی وەدەنێم. لەئامێزمی دەگرم. سەیری دەرگاکە دەکەمەوە. ئەفسانە خۆی هاویشتووەتەوە نێو دەرگاکە و من چنگم لە میزەکە قایمتر دەکەم.

«چوومە ژوورەوە. بەسی لە بین سەماوەرەکە دانیشتەوە. پرچی کالی زۆر جوان بوو».

ئەفسانە پرچەکانی داوێتە پشتسەری و بە بەری دەست ماچێکم بۆ داوێت. هەر ئەودەستی بە چوارچێوەی دەرگاکە دەگرێتەوە و بەتەمایە لەنگەری خۆی پێ رابگرێت. دەڵێی خەریکە بە قەڵەمبازێک خۆی باوێت. لە کەمەر بەرەوژێرم بە مێزی بەردەم مەش بایرامەوە نووساندووە. ئەفسانە خۆشەویستی و ئارەزووی باوەشی منی لێ دەبارێت.

«بەسە لووسە چاوی لێم کردەوە. نزیک بوومەوە. دەستم بردەوە بۆ لای رانی، پێکەنیەوە. دەستم گرتەوە و لە ئاغوشم گرتەوە. بەدیوارم

وەنـایـەوە. ماچێکم لـێـی‌کـردەوە. بـاش بـوو زوو بەهۆشم هاتمەوە. بە بیسیمەکە بە پاسگام گوتەوە یەک سەهات هەسەنە ڕەش لەولا رابیگرنەوە. دەرگام گایم کرد و بەسیم لە هەرزی داوە».

ئەفسانە ماچێکی دیکە داوێت.

«سواری سینگی بەسی بوومەوە. پالی بە من وەنا. توند دەستەکانی ئەوم گرتەوە. ئەویش توند هەردوو چاوی خۆی گوچاندەوە. دەستم بە رانەکانیدا هینا، لووسی لووس بوو. سینەی سافی خۆش بوو».

ئەفسانە ئەژنۆی ڕاستی دەکێشێتەوە و ئەژنۆکەی دیکەی دەداتە پێشەوە. کەمێک خۆی دەسووڕێنێت. بە هێواشی سمتی نیوەدیاری دەلەرێنێتەوە و ئەمجار بە دەستەکەی دیکەی لەنگەری خۆی لەنێو چوارچێوەی دەرگاکەدا رادەگرێتەوە.

«شێت بوومەوە. گوتمەوە کچە بەسی چاوت هەڵبینەوە چاوت زەک بکەوە».

– دەدینت دەڕیم حەجەمە، زووبە تەواوی کە. بۆیە چاوانم دەقووچێنم، نەتبینم. باوابزانم حەسەنی خۆم دەنێو لینگانمدایە. زووبە هەستە هەی بەبرای دەخۆت دەگێم. حەسەن بێتەوە هەر دەتگێ.

مەش بایرام بە شێوەزاری خۆی قسەکانی بەسێی گێڕایەوە. ئەوە تۆ بووی جارێکی دیکە لاسای بەسێت کردەوە. من چۆن سەرەتای هاتنم بۆ ئێرە قسەم دەکرد، مەش بایرامیش هەر ئەوا قسەکانی بەسێی گێڕایەوە. زۆر سەیرە ئەفسانە، تۆ زمانی بەسێش دەزانی!

میزە ئاسنەکەی نێوان من و مەش بایرام لە نێو پەنجەکانمدا نەرم دەبێت. دەبێتە ئەفسانە. دەستم لە نێوقەدی وەردێنم. نامەوێ لەشە ناسکەکەی ئازار بدەم.

«ئەوەندە خۆم بە بەسی خانم دادایەوە ئەرەقم کردبووە. لێوەکانیم دەمژی».



سنگی پتەوی مەودا دەخاتە نێوان خوارەوەتری بەژنی هەردووکمان. قژەکانی بۆن‌دەکەم. دەستەکانم لە دەوری کەمەری شل دەبنەوە. بەسەر هەردوو سمتەکانیدا دەخوشنە خوارەوە و خۆیان دەگرنەوە.

«بەگوربانت دەبمەوە بەسی جان! چاوت لەمن بکەوە».

دەستەکانم دووسمتی ئەفسانە رێک دەگوشن. تان و پۆی شەڵوارە جینەکەم تەڕاییەکی لیچق دەردەدات. هەست بە گەرمییەکەی دەکەم. مەش بایرام دیسان دەستی پێکردەوە:

– هەی بەسی هەمرم بەسی<br>
دووانت کوشتەوە مەیەکەوە بەسی<br>
بەسی لەوبەر پەنجەرە جوانە تەشی دەریسی...

پێش ئەوەی مەش بایرام ئاوڕ بداتەوە، جارێکی دیکە دەرگا تەسکەکە، ئەفسانەی هەڵلووشییەوە.

ئەم ترسە دایگرتم ئاغام هەموو ژیانی منی بۆ مەش بایرام بەیان کردبێ. بڵێی مەش بایرام لە دەرفەتێکدا بۆم نەگێڕێتەوە؟

* * *

لەشارەوە بەرەوسنوور، سواری جیپڵەندرۆوێرێک بووین. من لەپێشەوە دانیشتم و تەهمینە و توورەج و دوو کوڕە ئەفغانییەکە بە دەرگای پشتەوەدا سەرکەوتن. دەستێکم بۆ داشبۆرد برد و دەنگەکەم زیاد کرد. دەنگی خوێندنەوەی شیعرەکانی خەییامم بەرزتر کردەوە. لەگەڵ خەییام لەم سەفەرە داتبڕیمەوە. هاوکارەکەت گوێی بۆ شلکردبووی. ئەم شێعرەت بۆ دەخوێندەوە. کوردییە سووک و ڕەوانەکە بەدەنگی تۆ دڵی لەرزاندم. وام دەزانی گوێم داوەتە بێژەرێکی بەتوانا و دەنگی ناسک و خوێندنەوەی ڕەوانت خولیای شیعرەکەی کردم:

هاتوومە جیهان چم بە چ کرد؟ تێگەی: هیچ<br>
هەر بنج و بناوانی جیهان دەرخەی: هیچ!

ڕووناکیدەرم، شەمم، کەفووم لێکەی: هیچ
نەینۆکی دەسی جەمم، لەبەردم دەی: هیچ!

لە کۆتایی چوارینەکەدا زایەڵەی وشەی هیچ، چەندین‌جار لە گوێمدا دەزرینگێتەوە. هەست دەکەم لە شوێنێکی دیکە ئەم شیعرەم بیستووە. کەمێک مێشکی خۆم ڕێکدەگوشم. ناسیمەوە! ڕەنگە ئەم چوارینەیە بێت:

بنگر ز جهان چه طرف بر بستم ؟ هیچ
وز حاصل عمر چیست در دستم ؟ هیچ
شمع طربم ولی چو بنشستم هیچ
من جام جمم ولی چو بشکستم هیچ

– خاهەر ئەوە وەک شیئری خەییام دەچێت.

– هی خەییامە. نەتخوێندووەتەوە؟ منیش خاهەر نیم، ناوم ئەفسانەیە.

– ئەفسانە خانوم ببەخشن، شیئری خەییام بە کوردی نییە.

– ڕەئیس چی پێ‌گوتی؟

– فەرمووی بچوو پیشی ئەفسانە خانوم بیزانە پەروەندەکەت پیشی ئەوانە؟

– تۆ کورد نی؟

– لە تەبریز هاتووم.

پەنجەت لە لێوت دا. لێوت ئەوەندە تورت و پتەوە، دوای پەنجە لێدانەکە، شۆڕ نابێتەوە و نالەرێتەوە. هەر دەڵێی دەستت لێنەداوە. لاپەڕەکانت هەڵدایەوە. سەرت بەرەو دێڕەکان نەوی کردەوە. برژانگی درێژت بردیانمەوە ئەو ساتەی بۆ یەکەمجار لە مەیدانی مەقسوودیە برژانگەکانی ئەفسانە چەقینە نێو ژیانمەوە.

– ئەم نامەیە لە دادگاوە هاتووە. داوایان کردووە بزانین سابیقەت لێرە هەیە یان نا. دەبێ لە بایەگانیدا بگەڕێین. هەفتەی داهاتوو سەرمان لێبدەوە.



لە ئیدارەکەتان چوومەدەرەوە و خۆم گەیاندە کتێبفرۆشی. لەنێو کتێبە کوردییەکانی نێو ویترینەکەدا بەزەحمەت پیتە کوردییەکانی سەر بەرگی کتێبەکان دەبەمەوە سەریەک. چاوم بە خەییام بەکوردی کەوت. کڕیم و لەگەڵ خۆمدا بردمەوە. ڕێنووسی کتێبەکە لەگەڵ ڕێنووسی فارسی زۆر جیاوازە، بەڵام هەرچۆنێک بێت سەروگوێی پیتەکان تێکدەشکێنم و چەند وشەیەکیان لێ‌ساغ دەکەمەوە. چاوم بە هەر چوارینەیەک دەکەوێت، پێش ئەوەی هەوڵبدەم بیخوێنمەوە، دەنگی ئەفسانە لە گوێچکەمدا دەزرینگێتەوە. چرکە و دەقیقە و سەعاتەکانی ئەم هەفتەیە لەبەریەک دەکشێنەوە. شەوانە نازانم کەی خەو هیلاکم دەکات. خەو زۆر بەزەحمەت بەسەر ئەم خەیاڵانەدا سەردەکەوێت و تا درەنگانێک ئەم مێشکە ئاڵۆز و سەرقاڵەمی پێ لەکار ناکەوێت. شەڕێکی گەرم لە نێوان دوو ئەفسانەی کۆن و نوێدا دەستی پێکردووە. هەردووکیان دێنەوە بەرچاوم. دەترسم واز لە ئەفسانەی تەورێز بێنم و ئەم ئەفسانەیەشم بۆ دەستەمۆ نەبێت. ئەفسانەی مەش بایرام وازم لێ ناهێنێت. دەمباتەوە مەیدانی مەقسوودییە و دیسان بەرەو بەرمێزی دووکانەکە رامدەکێشێتەوە. چاوەکانم بە تەنیشت ڕەفە بە شتومەک هەڵچنراوەکانی نێو دووکانی مەش بایرامدا لەسەر درزی دەرگاکە لەنگەر دەگرن. نازانم لە کورتەساتێکدا چەند جار ئەفسانە ئەم پەندەم بەسەردێنێت. بێهوودە لاپەڕەی کتێبەکە هەڵدەدەمەوە و لەنێو پیتەکانی تایبەت بەزمانی کوردیدا دەمێنمەوە. تۆش لە پەنا نیشانەکانی سەر پیتە کوردییەکاندا خۆم پێشان دەدەی. وەک چاوم بۆ ڕوانینی وێنەیەکی سێ‌ڕەهەندی لەسەر پانتایی لاپەڕەکەدا ماندوو بووبێت، لەنێو هەموو لاپەڕەکەدا دەتوێیەوە. ئەو کاتەی لاپەڕەیەک هەڵدەدەمەوە، هێڵە ئاسۆیی و ئەستوونییەکانی لاپەڕەی کتێبەکە لێم دەبن بە درزی دەرگاکەی پشت مەش بایرام. ئەفسانەم لێ دەردەکەوێتەوە و خێرا تۆ وەک وێنەی سێ‌ڕەهەندی لە پانتایی لاپەڕەکەدا لەپشت پیتەکانی

تایبەت بەزمانی کوردییەوە سەرهەڵدەدەیەوە و ئەفسانەی مەش بایرام کاڵ دەکەیەوە. ئەوکاتەی خێرا لاپەڕەکان هەڵدەدەمەوە، تۆش خێراتر لەگەڵ ئەفسانەدا جێگۆڕکێ دەکەی. ئەو ناهێڵێت بۆ ماوەیەک چاو بەسەر دێڕەکاندا دابگرم و تۆش لێناگەڕێی لەکاتی هەڵدانەوەی پەڕەکاندا خۆمی بۆ بگێزرێنم. ئاخری کتێبەکە وێکدەنێم و لە رووبەرگی دواوەی لە پشت هەموو حەوتەکانی چوارینەکەی لێم دەردەکەویەوە. شەوانە ئەگەرچی چرای ژوورەکە دەکوژێنمەوە، دیسانیش هەر شێعرەکەی خەییام لەدەمی تووە لەگوێمدا دەزرینگێتەوە و سینەی ئەفسانەی مەش بایرامیش لەنێو چوارچێوەی دەرگای دووکانەکەوە بەرانبەرم دەلەرێتەوە. هەر کاتێک بۆ ماوەیەکی کورت لێتان دادەبڕێم، چاوەڕوانی بەرەو کۆتایی ئەم هەفتەیە ئەوەندەی دیکە قورسایی تێپەڕینی کات دەخاتەوە سەرشانەکانم. لای من ئەم حەوت ڕۆژ چاوەڕوانییە، بەقەرایی گەڕان بەدەوری حەوت تەبەقەی ئاسماندا دەخایەنێت.

چوارینە کوردییەکانی خەییامم گرتە دەست و هاتمەوە. کتێبەکەم جۆرێک گرتبوو، لە تووە دیار بێت.

– هەموو بایگانیم سەروبن کرد. ئەو زەمینەی تۆ باسی دەکەی، بە ناوی کابرایەکی ئەم شارەی دراوسێمانە.

– ئەمە زەمینی بابامە.

دەست بۆ کتێبەکە درێژ دەکەی. وەک ئەوەی دەستم لەژێر دەستەڵاتی تۆ دابێت، کتێبەکەت بۆ شل دەکات.

– تۆ کوڕی میرۆ نی. باوکت ناوی سەفەرعەلی بوڵوتئۆغلوویە. تۆ خەڵکی تەوریزی. لە نامەکەی دادگادا نووسراوە کەسێک بە ناوی رەزا بوڵوتئۆغلوو داوای ئەم زەمینە دەکات. ئەگەر سابیقەی پێشووی لای ئێوە هەیە، ئاگادارمان بکەنەوە. زۆر گەڕاین، رابردووی تۆ لەنێو هیچ پەروەندەیەکدا تۆمار نەکراوە. ڕەنگە رابردووی تۆ زۆر ئاڵۆز بێت.



«تۆ چۆن دەزانی رابردووی من ئاڵۆزە ئەفسانە؟ ئەوە ئێستا ئەم قسەیە دەکەی، ئەی ئەگەر پرێسکەی دڵمت لا بکەمەوە و نزیکەی چل ساڵ ژیانی خۆمت بۆ بەیان کەم و ماشەری ئاڵۆزی ژیانی ئەم ماوەیەت فرێدەمە پێش، ئەوکات چەندە هەست بە ئاڵۆزیی رابردووم دەکەی؟ تۆ کە بەم خێراییە هەستت بە ئاڵۆزیی رابردووی من کرد، ڕەنگە هەر تۆش بتوانی بێئەوەی داوەکانی ماشەری رابردووم پسپس بکەی، لەبەریەکی هەڵوەشێنیەوە و هەودایەکی درێژم بۆ رابیڵ بکەی. هەودایەک بە دەشت و دەردا ڕاکێشرابێت. بەسەر کێو و رەوەزە بەردەکاندا ئاوا بوویێت و بە نێوان پنچک و درەختی لێڕەوارەکاندا تێپەڕیبێت و ژووری باڵەخانەکانیش گەڕابێت. منیش سەرێکی بگرم و بەدوایدا برۆم و بگەمە ئاکامێک کە هەرگیز بیریشم لێی نەکردۆتەوە.»

– ئەم کابرایە زەمینەکەی غەسب کردووە و نامداتەوە.

– تۆ گوتت باوکم ناوی میرۆیە؟

– بالی.

– ئەو ئاغا میرۆیە ئێستا لە کوێیە؟

– لە گەیدی حەیاتدا نەماوە.

– ئەوەندەی پێوەندیی بە ئیدارەی ئێمەوە هەبێت، وەڵامم دایەوە.

کتێبەکەت لێکردەوە و بە دەنگە بەسۆزەکەت چەند چوارینەی دیکەت خوێندەوە. کاتێک شیعرەکانت دەخوێندەوە، دەمزانی وەرگێڕاوی کام چوارینە فارسیەکانن و حەزم دەکرد بەم راوێژ و دەنگە خۆشەت هەموو کتێبەکە بخوێنیەوە.

– ببەخشە ئەفسانە خانوم، من چۆن دەتوانم فێری خاندەنی زەبانی کوردی ببم؟

– تا ئێستا گۆڤار و کتێبی کوردیت نەخوێندووەتەوە؟

شەرمم کرد بپرسم گۆڤار چییە.

– نەخێر، ئەرزم کردی لە تەبریز زندەگیم دەکرد.

– ئەی ئێستا؟

– ئەلئان هاتوومە ئێرە و فێئلەن لێرەم و بەدوای شکایەتی زەمینەکەمدا دەڕۆم.

– من ڕۆژانی پێنجشەممە لێرە زوو تەواو دەبم، پێنجشەممەیەک وەرە کەمێک فێری کوردیت دەکەم.

– زۆر مەمنوون، هەتمەن دێم خدمەتتان.

* * *

لە گوندێکی دیوی ئێران شۆفیری لەندرۆوێرەکە، شووشەی تەنیشتی لادا و دەست و سەری بردە دەرەوە و بەدەنگێکی بەرز سڵاوی لە پیرەپیاوێک کرد.

– سەلام مەش بایرام، بویون نێئجە سەن؟[1]

کابرا راوەستا و جوابی سڵاوی دایەوە و بە تەنیشت جادەکەدا کەوتەوە دوای گا و چێڵەکان. لە پشت میزە ئاسنەکەی بەردەم مەش بایرامدا چەقیمەوە.

– مەش بایرام! چەند ساڵ لەو دێیە رەئیسی پاسگاهـ بووی؟

– عەجەلە مەکەوە، شەوێک دێم بۆماڵی مەش سەفەرعەلی و زۆرتر گسە دەکەینەوە. زەمانی شا رەئیس پاسگاە هەمەکارەی مەملەکەت بوو. لە دیهات فەگەت ئیمە حکوومەت بەدەستمان بوو. کەس نەیدەوێراوە دەنگی بکاتەوە. گودرەتی هەمووشت بە دەستی ئیمە بوو. زندەگی ئیمە لە سایەی شاهەنشاهـ شاهانە بوو. منیش ئەو زەمان جەوان بووم. مەردومی ئەوی هاموسی کاریان دەکردەوە و خەستە بوون. ئای چەندە لەوی بۆخۆم ئیشکبازیم کردەوە؟ ئەلان ئەمین پیر بووم و زەمانەش خراب بووتەوە. ئەریڤەلا ئیزا جان من تازە گۆجالدم. گوسە مەخۆ،

[1] – سڵاو مەش بایرام ئەمڕۆ چۆنی؟



بەئدەن ریز ریز بۆت دەلیمەوە. هەتمەن یەکشەو دیم بۆ مالی مەش سەفەرئەلی. مەش سەفەرئەلی زۆر ئیسلامییە، ئەمما پیاوی باشە. خاهیش دەکەمەوە تو بە ریگای ئەو مەچوو.

بەڵێنیی مەش بایرام تووشی دڵەڕاوکێ و چاوەڕوانیی کردم. بڵێی لەسەر قسەی خۆی بێت و شەوێک بێتە ماڵمان؟ ئەگەر بێت، بڵێی ئەو قسانەی ئەو ڕۆژە لە دووکـان لەگەڵ ئاغام کردبوویان، چیان لێدەرکەوێت؟ مەترسییەک سێبەری بەسەرم داگرت. لە مـاوەی ئەم چەند ڕۆژەدا دەترسام و ورەم وەبەرخۆم دەنایەوە. باشە ئەگەر قەرار بێت مەش بایرام قسەکانی بەدڵی من نەبن، هەر لە ئێستاوە پێیەوە دیار دەبێت. ئەم چەند ڕۆژەی دوایی جۆرێک بەزەیی و خۆشەویستی بە ڕوخسارییەوە دیارە. چەندی دەکەم و دەکرێنم ئاغا و مامان لەبارەی رابردووی منەوە هیچ شتێک ناڵێن. دەترسم ئەوەی من نایزانم، مەش بایرام ئاگاداری هەمووی بێت. خۆزگە ڕۆژێک لەخۆم رادیبا لەگەڵ ئاغام دانیشم و ئەویش بەوردی وەڵامی هەموو پرسیارەکانم بداتەوە. ناوێرم. من هەم وەک باوک و هەم وەک مامۆستا لە ئاغام دەترسم. دەبێ ڕۆژێک غیرەت وەبەرخۆم بنێم و لە ئاغام بپرسم. من دەزانم ئەو لە هەموو کەس باشتر ئاگاداری رابردووی منە. ئەگەر ئاغام لای خەڵک باسی رابردووی منی نەکردووە، بۆچی هەموو کەس لێرە پاشملە پێم دەڵێن ئیزا بیژی؟ ڕەنگە ئاغام تەنیا لای مامان بە وردی باسی منی کردبێ و بیژووبوونی من لە زمان ئەوەوە لەنێو ژنانی گەڕەکدا داکەوتبێ.

«رەزای بولووتئۆغلو، ئەوە چییە بیری لێدەکەیەوە؟ نە ئاغا شتی وای گوتووە و نە مامانیش بیر لەشتی وا دەکاتەوە. هەر ئەوەی من جاروبار ڕستەیەکی کوردی دەڵێم، بۆ ئەوەی لەبیرم نەچێتەوە، خەڵک وا دەزانن کوردم. دەی باشە ناحەق نین. ئەگەر کوردبم، کوڕی ئاغا و مامان نیم. دەبێ هەر کاری مامان بێت. نانا، چۆن دایک ئاوا باسی کوڕی

خۆی دەکات؟ ئێستاشی لەگەڵدابێت، بەزەیی دایکانە نەبێت مامان هیچی دیکەی پێوە دیار نەبووە. ئەوەندە مامانم خۆش دەوێت، ڕەنگە قەت نەتوانم لەمبارەیەوە پرسیاری لێبکەم. نابێ هەرگیز مامان بزانێت ئەم پرسیارە لە مێشکی مندا وروژاوە کە لە دایکی خۆم بە گومانم.

ئەوە چییە رەزا؟ بۆ ئەم گومانانە لە خۆت دوور ناکەیەوە؟ چونکە گەورە بوویە و بوویەتە پیاوێکی تەواو، مامان ئیدی وەک منداڵ سەیرت ناکات و لەباوەشت ناگرێت. خۆ هێشتا بۆ ماوەیەکی درێژ لێی دوور نەکەوتوویەتەوە تا لە کاتی گەڕانەوەتدا بزانی بە تاسەوە باوەش بە تاقانە کوڕی خۆیدا دەکات یان نا. مامان گیان! ئەم تاقیکردنەوەیە بۆ کاتێک هەڵدەگرم کە ماوەی چەند ڕۆژێک لێت دوور بکەومەوە.

ئەم دڵەڕاوکێیە فرێدە رەزا. ئەی لەبیرت چۆتەوە ئەوکاتەی لەگەڵ کوڕەکانی بەسیج چوویە جبهەی شەڕی ئێران و ئێراق، مامان دوای گەڕانەوەت چۆن باوەشی پێداکردی و بەخۆیەوە گوشی؟ ئەی ئەوکات فرمێسکەکانی بە گۆنایدا نەهاتنە خوار و لاملی تۆشیان تەڕ نەکرد؟»

من هەر لە سەرەتای منداڵیمەوە و ئێستاشی لەگەڵدابێت، پشووسوار و بە پەلەم. هەمیشە حەزدەکەم لە کورتترین ماوەدا دەستم بە نهێنییەکان رابگات. کاتێک بەسەر ئاشکرابوونی نهێنییەکیشدا دەکەوم، دیسان بەپەلە تەما دەگرم و لە کۆتاییدا هەست دەکەم ئەم تەماگرتنە لەناکاوەم لێم دەبێتە هەڵەشەکاری و لە کۆتاییدا تووشی زیانی ئەوەندە گەورەم دەکات، هەرگیز بۆم تێهەڵنایەتەوە. ئەوەیان گەورەترین کێشەی ژیانمە و بەدرێژایی تەمەنمدا وەک سایە لەگەڵمدایە. ئەمجارەیان واناکەم. هیچ پەلە ناکەم. هەرچی مەش بایرام بیڵێت، بەوردی بیری لێدەکەمەوە. ئەگەر مەش بایرام نهێنییەکی شاراوە ئاشکرا بکات، بە پشووی درێژەوە لێکی دەدەمـەوە. بەکاوەخۆ بیری لێدەکەمەوە و ئەمجار تەمای خۆمی بۆ دەگرم.



بێدەنگ بە شێتە. ناڵێم ئەم خەیاڵاتە پڕوپووچانە لە مێشکت وەدەرنێ؟

لە چاوەڕوانیدا هەست دەکەی دڵت خێراتر لێدەدات. لە چاوەڕوانیی بەڵێنەکەی مەش بایرامدا، هەمووشەوێ بەرلە خەوتن، دڵەکوتەکەم زیادی دەکرد. شەوانە مەودای زیاترم بۆ بیرکردنەوە هەبوو. دڵەڕاوکێی بیستنی قسەکانی مەش بایرام و بیرکردنەوە لە چارەنووسی خۆم و ئەفسانە، دڵەکوتەکەیان زیاتر دەکرد. پێش خەوتن ئەم دڵەڕاوکێیانە لەخۆیان دەگرتم. کاتێک خەو دەیبردمەوە، دوای خەونووچکەیەک ئەفسانە دەهاتەوە. هەر بەڕاستی من گیرۆدەی ئەفسانە بوومە. بە شەو و بە ڕۆژ لەگەڵ ئەفسانەدا دەژیم. دەڵێی لەم چەند ساڵەی ژیانمدا ئەفسانە لێم لە کەمیندابووە و ئێستا وەک سەربازی بەرەی شەڕ دەستەویەخە لێم ڕاست بۆتەوە. هەست دەکەم ئەوە ئەفسانەیە ئەمدەست ئەودەستم پێدەکات.

ڕاستـە تۆ لـە ئەفسانەی مـەش بایرامت ئەستاندم. بـەڵام دەڵێی لەسەر بەرزاییەکی زۆر بەرزەوە هەڵیانداومەتە خوارەوە و لە ژێرەوە ئەفسانەکان دیارن. پارچەپارچە دەبن. لەت نابن، دەڵێی زاوزێ دەکەن و خێرا ئەفسانە بچووکەکان گەورە دەبن. هەمووشیان وەک یەک دەچن. لە بەرزاییەکەوە شۆڕ دەکرێمەوە. چەندی دەکەم خەبەرم نابێتەوە. هەر بەرەو ئەفسانەکان شۆڕ دەبمەوە و خێراییم زیاتر دەبێت. دێم لێتان نزیک بمەوە، قووڵاییەکە قووڵتر دەبێتەوە و منیش شۆڕبوونەوەکەم خێراتر دەبێت. ئەفسانەکان وێڕای ئەوەی لە زیادبووندان، زیاتر بە قووڵاییەکەدا ڕۆدەچن و لێم دوور دەکەونەوە. من خێراتر دادەبەزم و ئێوە خێراتر زیاد دەکەن و خێراتر دوور دەکەونەوە. نە دەتانگەمێ و نە خەوە قورسەکە بەرم دەدات. دەڵێی خەو و ئەفسانە بۆ ئازاری من دەستیان تێکەڵ کردووە. نە خەو بەئارامی لە خۆم دەگرێت و نە لەباوەشی ئەفسانەدا دەحەسێمەوە.

* * *

شەقەی داخستنەوەی شووشەی لەندرۆویەرەکە بەهانامەوە هات. کابرای شۆفیر جارێکی دیکە لە مەش بایرام و گا و چێڵەکانی روانی. بزەیەکی هاتێ و سەری بۆ بادا. سەیرە! بۆ شۆفیرەکە بە تورکی قسەی لەگەڵ مەش بایرامدا کرد؟ ئەی ئەوە نییە ژنانی ئەم گوندە هەموویان بە جلی کوردییەوە دێن و دەچن؟ خەریکم دەست بۆ داشبۆردەکە بەرمەوە و دەنگی خەییامەکە زیاد کەمەوە. بۆ چەند چرکەیەک گوێم لە سرتوخورتی توورەج و تەهمینەیە.

– پێکەنینم بە دەسکە گوڵەکەی شەوی خوازبێنی دێت.

– دایکم دەیگوت دەبێ گرانترین چەپکەگوڵ لەگەڵ خۆمان بەرین.

– دایکی منیش ئەگەر دەیزانی تووشی ئەم دەرە و کێوانەم دەکەی، بە دەسکە گوڵەوە فڕێی دەدایە دەرەوە.

– هەهەهەه، ئەوە ئێستا بە خۆتەوە فڕێم دەدەنە ئورووپا...

– ئاگات لە زمانت بێ! بڵێ ئەمریکا یان کانادا...

دەک ماڵی باوکتان رمێ، لەم کاتەدا باسی چی دەکەن! من ئەم ئەفسانە جوانانەم هەبوو، کەس نەبوو دەسکە گوڵێکم بۆ بکڕێت و بەرەوماڵی ئەفسانە وەپێشم کەوێت.

دەنگی شریتی شێعرەکانی خەییام، دەنگی تـوورەج و تەهمینە دادەپۆشێت.

بێهوودەیە بیر و خەم، دڵت خۆشکە برا
پرسیار نەکرا، بەشت درا هەرچی درا
تۆ هێشتا نەهاتوویە جیهان، رۆژی بەرێ
ئەو رۆژەی دەبوو بچییەدەرێ...

خۆم چوومە دەرێ. ئەو شەوەی لەدەرگای ماڵی ئێمەیاندا، خۆم رۆیشتمە دەرەوە و دەرگـام کـردەوە و فەرمووم لێکردن. بە دیتنی



ئەفسانە شاگەشکە بووم. نەمتوانی ئەم هەستەم لە مەش بایرام و عەممە جەیرانیش بشارمەوە. هەمووومان لە هاڵەکە دانیشتین. من وەک تاقانە کوڕە لە خزمەت میوانەکاندا بووم و یارمەتیی مامانم دەدا. میوانەکان بە تاسەوە گوێیان بۆ قسەکانی ئاغام شل کردبوو.

– ئیزا، تاقانە کوڕی خۆمە و بەناو ئیمام رەزام کردووە. ئێمە لەو تاقە کوڕە زیاتر منداڵی دیکەمان نییە.

مامان لە ئاشپەزخانەوە بۆڵەیەکی لێوەهات. چووم سینیی شەربەتەکانی لێوەربگرم. بێزاری بە روخسارییەوە دیار بوو. خێسەیەکی لێکردم. تا ئێستا ئەم جۆرە بێزارییەم بە روخساری مامانەوە نەدیتبوو. پێموابوو چونکە درەنگ چووم یارمەتیی بدەم، رەنگە لێم تووڕە بووبێت.

ئاغام جارێکی دیکەش گوتی: ئەوەی لەبارەی ئیزاوە لەنێو ژن و ژاڵی گەڕەکدا بڵاو بۆتەوە، هەمووی درۆیە. ئیزا کوڕی خۆمانە. بە ناو ئیمام رەزامان کردووە.

وردەوردە تووڕەیی مامان زیاتر دەبوو. بە چەند ئیشارەیەک ئاغامی سەرکۆنە کرد. ئاغام لە ژێر ئیشارە و ئێماکانی ماماندا باسەکەی گۆڕی.

مەش بایرام و عەممە جەیران، هەستیان بە رووگرژییەکەی مامان کرد. مەش بایرام کە هەتا ئەوکاتە خەریک بوو دەمی بۆ قسەکردن خۆش دەکرد، دیاربوو خەریکی پاشگەز بوونەوەیە. ئەفسانە لە هەر دەرفەتێکدا لە بنەوە سەیرم دەکات و بە نازێکی تاسەبارەوە لێوەکانی کۆدەکاتەوە و نازە بزەکانی پێ حەشار دەدات.

ئاغام هەستی بە دڕدۆنگیی میوانەکان کرد. بەدزییەوە مۆڕەیەکی لـە مـامـان کـرد. بـە بیانووی یارمەتیدانی مـامـان دیـسـان چوومـەوە ئاشپەزخانە. لەوێوە بەجۆرێک راوەستام، تەنیا ئەفسانەم لێوە دیار بێت. ئەفسانە هەست دەکات چاوم لێیەتی. مستێکی قووچاو لە قەڵشتی نێوان تەنیشت و ژێری مۆبڵەکە دەئاخنێت و بە کراوەیی دەری دێنێتەوە.

دوو سێوی سپی لەسەر میزەکەی بەردەم ئەفسانە، دەڵێی بە تەمان لەنێو میوەکانی دیکەوە هەڵبەزنەوە. ڕێک بەقەرایی یەکترین، سپی. هەردووکیان قاچکەکانیان کەوتووەتە ژێرەوە و لای گوڵوکیان ڕووەو سەرەوەیە. سێوەکانی ئەفسانەن. خۆیان بۆ نەوی دەکات و دەستیان بۆ دەبات. هەردوو سێوەکانی خۆی گوڵوکیان بەرەو گوڵوکی دووسێوی نێو دەفرەکەیە. کراسەکەی لێناگەڕێ بکەونە نێو دەفری میوەکانەوە. چ دەبوو کەوتبانە نێو دەفرەکەوە؟ هەڵدەبەزنەوە. نەرم و تورت و پڕ. دەستیان دەدەمێ. ناهێڵم نە مامان و نە ئاغام هەست پێبکەن. ئەم تووڕەیی و لووت داژەنینەیان بە دەرفەت دەزانم. بەپەلە سێوەکانی ئەفسانە دەبەمە ژوورەکەی خۆم. لە ژێر نوێنەکاندا دەیانشارمەوە. هەمووشەوان بەر لەخەوتن، ڕێک بەو مەودایەی لەسەر سینەی ئەفسانەدان، دایاندەنێمەوە. دەستیان لەسەر دادەنێم. دەمم دەخەمە نێوانیان و چنگیان لێگیردەکەمەوە. لەم دووسێوەڕا پەیکەری ئەفسانە دادەڕێژمەوە. ئەفسانە لە هەموو شەوانی تەنیاییمدا دێتەوەلام. بژی ئەفسانەی من، هەمیشە لەگەڵمدای. بۆ چرکەیەک لێم دوور ناکەویەوە. دەست بۆ پرتەقاڵێک دەبات. پێمخۆشە. دەزانم ئەم میوە مزرە زیاتر دەم و لێوی بەرەو جووڵە و چڕبوونەوە و خاوبوونەوە دەوروژێنێت. دەمی ئەو، ترشایی پرتەقاڵەکەی پێوە دیارە و دەمی من ئاوی خولیایی دوو سێوەکانی ئەوی دەرداوە. لە ژێر ئیمای دایکیدا پەلە لە پرتەقاڵەکە دەکات و خێراتر ئاوە ترشەکەی هەڵدەمژێت. قومە ئاوە ترشەکان بە گەردنی بەرزیدا وەک چەند شەپۆلێک بەرەو سینەی شۆڕ دەبنەوە. ئەم قومە ئاوانە لە ڕەگەکانی دارسێو دەمرن و سێوەکانی سەرسینەی پاراو دەکەن. بەدەم خۆکۆکردنەوە و هەستانەوەوە، لەگەڵ قوتدانی دوا پاشماوەی ئاوی پرتەقاڵەکە، دەم و لێوی وێک دێنێت و تا قووڵایی ئێسقانەکانم هەست بە ترشایی نێو دەمی دەکەم.



کاتی هەستانی میوانەکان، پێشیان کەوتم. خۆم گەیاندە بەردەرگا. دەستم بە دەرگای یەکەمی هاڵەکەوە گرت و ژنەکان پێشکەوتن. شەرم و دڕدۆنگی لە ڕوخساری عەممە جەیرانەوە دەبارێت. مامان لەدوایەوە بەنێو دەرگادا تێدەپەڕێت. هەنگاوی قورس و قایمی، سەرکەوتنیان پێوە دیارە. دەرفەتەکە دەقۆزمەوە و لە پێشەوە خێرا لە بەری پێوە تا تەوقی سەر لە ئەفسانە دەڕوانم. شاقەلی چاکەتەکەی مەش بایرام پانتای دەرگاکە دادەگرێت و ناهێڵێت چیدیکە لەدواوە سەیری ڕەوتی ئەفسانە بکەم. دیسان دەرفەت دەقۆزمەوە. بەرلەوەی میوانەکان بگەنە دەروازەی حەوشە، جارێکی دیکە خۆم دەگەیەنمە بەر دەروازە. هاوتەریبی تای نیوەکراوەی دەروازە پێم دەچەقێنم. لە بەری پێوە تا تەوقی سەر بە میوان و خانەخوێکاندا هەڵدەڕوانم.

دوای ئەوەی میوانەکان ڕۆیشتن، خۆم گەیاندەوە قەڵشتی مۆبڵەکە. کاغەزێکی قەدکراوم دەرهێنا و تا ئەوکاتەی چوومە ژووری خەوم، لەنێو گیرفانمدا دەستم پێدا دێنا و ئارەزووم دەکرد پیتەکانی زەق بنەوە و بە دەست لێدان هەستیان پێ بکەم. لەم کاتەدا بەدڵ ئارەزووم دەکرد کوێربام و خوێندنەوەی نووسینی تایبەت بە کوێرانم زانیبایە و نامەکەش هەر بەم خەتە نووسرابا. بە پەلە چاوەڕوان بووم ئاغام بڵێت بۆ نارۆی بخەوی. ئەم کاغەزە نەخوێنراوەیە، تاسەی قسە نەبیسراوەکانی مەش بایرامی سووکتر کرد.

« سەلام ئیزا جان. پێش ئەوەی لە مەیدانی مەگسوودیە سەر ڕێگەم پێبگری، دلی منت بردبوو. دووسال پێشتر، ئەو کاتەی لە مەدرەسەی ئێمە نمایشی سەتارخانتان پێشان‌دا، نفووزت کردە ناودلم. تۆ لە نەگشی سەتارخاندا زۆر جوان بووی. ئەو وەختە گریمەکانیان لێتان کردەوە و وەک خۆت هاتیە سەر سێن و جایزەکەیان پێت دا، دلم کەوتە تەپش. گوتم دەبێ ئیزا بولۆووتئۆغلۆ تەسخیر بکەم. لەو وەگتەوە ناوت زەبانزەدی

هەموو دانشئاموزانی دەبیرستانی ئێمە بوو. من دوای ئەوو ەگتە هەر فکرم لەوە دەکردەوە چۆن ئیشگی خۆم بە تو ئیبراز بکەم. ئەو ڕۆژە بۆ یەکەمجار لە مەیدان مەگسوودیەوە هاتی بۆ دووکانی بابام، مامانم هات بابامی بۆ ناهار خواردن بانگ کرد. وەگتێک من هاتم تۆ لەوێ نەمابووی.

خەڵکی محەللەکەمان وا دەزانن تو کوری مەش سەفەرئەلی نی. ئەوشەوە بابام بۆ مامان دەیگیراوە و دەیگوت مەش سەفەرئەلی لە دووکان چۆن باسی تۆی بۆی کردووە. مەش سەفەرئەلی بە بابامی گوتبوو ئیزا کوری خۆمە. ئەو وەختەی چووم بۆ کوردستان، ئیزا سنی هەر شەش هەفت سال دەبوو. تاقانەبوو، دلم نەهات لە تەبریز بەجێی بێلم. لەگەل خۆم بردم بۆ دیهاتی کوردستان. گوتم با سالانی ئیبتدایی بۆخۆم دەرسی پیبلێم. ئیزا لەوێ زۆر زوو فێری زمانی کوردی بوو. وەگتی کە دوای دووسال لە کوردستان گەرامەوە تەبریز، ئەم خانوویەم لەم کوچەیە کری. سێ مانگ پێش ئەوەی بە یەکجاری بیمەوە بو تەبریز، مالەکەمان بۆ ئێرە گواستەوە. خەڵکی گەرەکەکە زەمانێک دایکی ئیزایان بە تەنیا دیتبوو، وایان زانیبوو هیچ ئەولادمان نییە. من کە گەرامەوە تەبریز، ئیزام لەگەل خۆم هیناوە. هەمسایەکان وایانزانی ئیزا کوری من نییە و لەبەر ئەوەی مندالمان نییە، کردوومە بە کوری خۆم.

شەوی دوای ئەوەی ئاغات بۆ ئاغام گسەی کردبوو، چوومە حەمام. ئاوی دووشەکەم گرتەوە. بابا و مامان باسی تویان دەکرد. بابا گوتی، خەلک درۆی دەکەن دەلێن ئیزای مەش سەفەرئەلی بیژیە و لەنێو کوردان هیناویەتی. گوێم بە کونی کلیدی دەرگای هەمامەکەوە بوو. بابا بە مامانی گوت مەش سەفەرئەلی بە تەنها ئەم کورە جوانەی هەیە. ئیمەش هەر ئەفسانەمان هەیە. پێمخۆشە ئەفسانە ببیت بە بووکی. هەم لەخۆمان نزیک دەبیتەوە و هەم خانەوادەیەکی زۆر باشن.



مامان گوتی، ئەدی لەبەر گسەی خەلک چی بلێین، ئەوان دەلێن ئیزا بیژییە. کوری مەش سەفەرئەلی نییە. ئەدی بۆ مندالی دیکەیان نابێت؟ جیا لەوەش، ئەفسانە تازە دەبی بچیت بۆ دانشگاھـ و ئیزا لەدانشگاھـ خوێندوویەتی. بابم گوتی، تەفاوەتی سنی هیچ نییە. کورەکە تازە بووە بە پیاو.

ئەو ڕۆژەش لای ئێوارە بوو. بابا گوتی با ئەمشەو سەرێک لەمالی مەش سەفەرئەلی بدەین. بە منی گوت، هەموومان دەرۆین. منیش لەدلی خۆمدا زۆر خۆشهال بووم. گوتم با ئەم چەند سەترەبۆت بنووسم و ئاگادارت بکەمەوە.

لە ئاخریدا دەمهەوێ لەم فورسەتە ئیستفادە بکەم و بلێم بە هەموو وجوودم خۆشم دەوێی. گوربانت، ئەفسانە»

نامەکە بە فارسی نووسرابوو. هەستم دەکرد ئەفسانە لەبەرچاومە. خۆی نامەکەم بۆ دەخوێنێتەوە و بەهۆی لەهجە ئازەرییەکەیەوە هەموو پیتەکانی قافم بە گاف دەبیست. نامەکە بۆنێکی تایبەتی لێوە دەهات. وەک هەموو بۆنێکی خۆش دەچوو، بەڵام هیچکامیشیان نەبوو. ئەم بۆنە دەبێ بۆنی ئەفسانە بێت؟ بۆنی تۆش وایە. هەموو بۆنێکە و هیچکامیشیان نییە. چەندجار خوێندمەوە. پێم خۆش نەبوو ناوی رەزا بیژوو لە هیچ شوێنێک ببیسم، بەڵام لە نامەکەی ئەفسانەدا ئەم هەستەم نەبوو. دەیگەڕاندمەوە سەردەمی منداڵی. سەردەمی منداڵیشم بەچەشنێک شێوابوو، نەمدەویست بیری لێبکەمەوە. ئەوەی دەمزانی زۆر ناتەواو بوو. قسەکانی ئاغام بۆ مەش بایرام، ورەی زیاتری وەبەردەنام. نامەکەی ئەفسانە وەک فریشتە بەهانامەوە هات. ئەو هەستەی پێدام دەنگۆی بیژوویەتیم لە گەڕەکی نەوباری تەورێز سەد ئەوەندەش دەنگ بداتەوە، کارم تێنەکات.

❋ ❋ ❋

جیپ لەندرۆوێرەکە لە دیوی ئێران لە نێو ئاخرین گوندی سەرسنووردا

راوەستا. شۆفیرەکە ئێمەی دایە دەست پیاوێکی دیکە و خۆی دابەزی. پێیگوت ئەمڕۆ پێنجشەممەیە، چەکدارە ئێشکگرەکانی سەرسنوور زۆربەیان بۆ ئیجازەی ئاخری هەفتە چوونەتەوە.

پێنجشەممە؟...

ڕۆژی پێنجشەممە، پێش ئەوەی لە ئیدارە بێیە دەرەوە، خۆم گەیاندە سەر پیادەڕۆی ئەوبەر ئیدارەی کشتوکاڵ.

ئەفسانە چۆن فێری خوێندن و نووسینی زمانی کوردیم دەکات؟ تۆ بڵێی بتوانم گوێ بۆ فێربوون شل بکەم؟ کوا ئەم پەیکەرەی جوانییە ئیزن دەدات هۆشم بچێتە سەر پیت و وشە و ڕستەکان؟ ڕەنگە واش نەبێت. دەکرێت تامەزرۆیی پێکگەیشتن، وانە گوتنەوەی ئەفسانە سەد ئەوەندە شیرینتر بکات.

دەرگاکەت کردەوە. مانتۆ تەسکەکە تۆی ڕێکدەگوشی. دەتگوت وەستایەکی پەیکەرتاشیی شارەزای ئیرۆتیکا هەر بۆ جوانی، جوانترین پەیکەری لە قوماشێکی یەکڕەنگ هەڵکێشاوە. قوماشەکە ئەوەندە کەمە، پەیکەرەکە ڕێک دەگوشێت. ڕەنگە واشنەبێت و پەیکەرەکە هەوڵ بدات گەمارۆی قوماشەکە بشکێنێت.

کاتێک لە پلیکانەکانی دەرگای ئیدارەکە بەرەو حەوشە قەڵەمبازت هاویشت، سەمای سینەت حەجمینی لە مانتۆ تەسکەکە هەڵگرت و خەریک بوو دوگمەکان بترازێنێت.

لەو یەکەم چاوپێکەوتنەی دووبەدوودا، من تەنیا گوێگر بووم. لە دانیشتنەکەی نێو پارکدا، هەتا لە پارکەکە نەچووینە دەرەوە، نەمزانیبوو چووینەتە ئەوێ. ئەو وشانەی لەدەمت دەهاتنەدەر، دواتر هەستم کرد هەمووی بە بنەبانی مێشکمەوە نووساون. وانەکانی ساڵانی سەرەتایی کە ئاغام لە قوتابخانە قوڕینەکەی گوندەکە پێی دەگوتین و وانەی قوتابخانەکانی تەورێز و تەنانەت لە زانکۆش بەمشێوەیە



لەمێشکم نەچەسپاون. ئەوەی تۆ فێرت دەکردم، دەتگوت بیرەوەریی کۆنن و لە دەروونمدا زیندوو دەبنەوە. دەتگوت ئاغامە و بە دەنگە خۆشەکەی چیرۆکی پەریی دەریایی هانسکرستیەن ئەندرسن بۆ منداڵان دەخوێنێتەوە. گوڵخونچەی نیوە پشکووتووی لێوت و ڕیزی ددانە سپییەکان و چاوبرکێی دوو هەناری نیوەدیاری قەڵشتی نێوان دوولایەخەی مانتۆکەت، لەگەڵ سەمای دەنگی پیتەکان بەیەکەوە لە مێشکم دەنیشتن.

لەگەڵ هەر کۆپلەیەک لەڕستەکاندا کە بەدوای یەکدا دەرتدەبڕین، ڕەوانبێژییەکەت ئەوەندەی دیکە گیرۆدەی دەکردم. نازانم لەو ڕستانەی لە دەمتەوە دەبارین و خۆشنەوایی چوارینە کوردییەکانی خەییام و خولیای گەیشتن بە ئەفسانەیەکی دیکە، کامیان وایکرد منیش وەک تۆ فێری زمانی کوردی بم؟

لەگەڵ تۆدا ئاگام لەوە برا چۆن یەکدابەدوو زمانم بەتەواوی گۆڕا. ئێستا کە تەنیا دووساڵ تێپەڕیوە، هەندێک جار دەمهەوێ وەک پێشوو قسەبکەم، بەڵام بۆم ناکرێت. بڵێی ئەگەر بەم شێوازە ئاخاوتنەمەوە بچمەوە تەورێز، ئەفسانە و مەش بایرام و ئەوانیدیکە چۆن سەیرم بکەن؟ ئاغام خۆی ماموستای ئەدەبیات و شارەزای زمان بوو. ئەو پێی سەیر نەدەبوو، بەڵام مامان ڕەنگە ڕکی لێم بێتەوە. ئەوکاتیش جاروبار ڕستەیەکی کوردیم دەگوتەوە، مامان پێی ناخۆش دەبوو. تەنیا هاتوچۆی دووکانی مەش بایرام وایکرد بە شڕ و شپڕێوی زمانی ساڵانی گوندەکەی کوردستانم لەبیر نەچێتەوە. خۆزگە ئەو نامەیەی ئەفسانە لە سووچی مۆبڵەکەدا داینابوو بەم زمانەی تۆ نووسرابا.

لەنێو ئەم شارەشدا هەست دەکەم زمانی من و تۆ لەگەڵ هی خەڵکی دیکە جیاوازە. بەڵام ئەوان حەزیان لێیەتی. چۆن من بە تاسەوە گوێم بۆ قسەی تۆ شل دەکەم، خەڵکی ئەم شارەش ئەوا کەیفیان بە قسەکردنی من

دێت. تۆ چ ناوێکی خۆشت لەم شارە ناوە. شاری گێلاساوا. ئێرە شاری گێلاسیسوورە، باغەکان و بازاڕەکان و سەرجادەکان پڕن لە گێلاس. ئەگەر وەرزی گێلاسیش نەبێت، پەیکەری گێلاسە سوورەکانی سەر چوارڕێیانەکانی شار دەتخەنەوە یادی وەرزی گێلاس. گێلاسەکانیش یەکتریان خۆش دەوێت. زۆرجار لەنێو هێشووی هەڵواسراوی لقی دارە گەڵا سەوزەکاندا دوو دوو پاڵ وێک دەدەن. هێندێکجاریش پێکەوە دەنووسێن و ئەگەر لێکیان بکەیەوە، خوێنیان لێدێت. خوێنی سوور و گەشی گێلاس. ئەوەنییە پەیکەری دوو گێلاسەکانی سەر شەقامەکەی نێو شاریش دووبەدوو پاڵیان وێکداوە؟ من و ئەفسانەش وەک ئەم دوو گێلاسە پاڵ وێکدەدەین.

لەم ماوەیەدا کە هاتوومەتە ئێرە، زۆرجار بەنێو بازاڕدا دەسووڕێمەوە و سەر بە دووکانەکاندا دەکەم. ئەو ڕۆژە لە یەکێک لە دووکانەکانەوە کابرایەکی بەتەمەنی چاویلکە لەچاوی سەر بە جامانە، فەرمووی لێکردم. دیاربوو ئەو خاوەنی دووکانەکە نییە. خاوەن دووکان بە نیشانەی ڕێزگرتن بەپێوە ڕاوەستابوو. چەند پیاوێک لەسەر کورسی دانیشتبوون و دەوری کابرای بەساڵاچوویان دابوو. یەکێکیان هەستایەوە و بەزۆر جێگەی خۆی دا بەمن. کابرا بەساڵاچووەکە، دەمێک تێمڕاما و گوتی خەڵکی کوێی؟ پرسیارێکی زۆر سادەبوو، بەڵام لە وەڵامدانەوەیدا مامەوە. بۆماوەیەک بێدەنگ بووم و پرسیارەکەم لە خۆم کردەوە. پرسیارێک نەبوو بتوانم لە ڕستەیەکدا وەڵامی بدەمەوە. هەر لەخۆمەوە بە مێشکمدا هات بڵێم میوانم. زۆر ڕاستیش وەڵامم دایەوە. من لەوەتی هەم میوانم. تا ئەم دواییانە لەتەورێز لەماڵی خۆمان وەک میوان وابووم. لەم شارەی ئێوەش میوانم و ڕەنگە لە داهاتووشدا لە شوێنی دیکە میوان بم.

– چەند جارێکە لێرە دەتبینم. هەر بەخێربێی.

– سوپاستان دەکەم. ڕاستە، مودەتێکە لێرەم.



– زەمانت خۆشە. ئەم زەمانەی قسەی پێدەکەی، دەبێ زۆر شتی لە پشتەوە بێت.

ئەو کات ئەم زەمانەی ئێستاشم نەبوو. زمانم لەهجەی ئازەری هەر پێوەدیار بوو، بەڵام هەوڵم دەدا ئەو وشانە هەڵبژێرم کە ئەفسانە لەو ماوە کەمەدا فێری کردبووم. کابرا پیرە لە ژێر چاویلکەکانییەوە بڕۆیەکی ماناداری لە کابرای دووکاندار هەڵتەکاند. نەمهێشت بزانن ئاگاداریانم. ئۆتۆمبێلێک لەبەر دووکانەکە وەستا. کابرای چاویلکە لەچاو، خۆی هاویشتە سەر گۆچانەکەی و کەمێک بە زەحمەتەوە لە سەر کورسییەکە ڕاست بۆوە.

– ئەوە بەدوامدا هاتن. دەبێ بڕۆم. دەتانبینمەوە.

پێش ئەوەی لە دووکانەکە دەرکەوێت، بۆ جاری دووهەم بڕۆی لە دووکاندارەکە هەڵتەکاندەوە. بێئەوەی خۆی بیهەوێت، ڕوخساری کەمێک بەرەو لای من وەرسووڕا. ئەمجارە زۆر لەسەرخۆ ئاوڕی لێدامەوە و گوتی: زۆر خۆشحاڵ بووم، حەتمەن دەتبینمەوە. قورسایی ڕستەکەی خستە سەر وشەی حەتمەنەوە.

* * *

لە بناری چیاکانەوە بەسواری جیپەکە بەرەو بەرزایی سەرکەوتین. شۆفیرەکە دابەزی.

– وەرنەخاریێ، ماشین لێرە پتر ناچە، پشتی ڤی چیایی، حدودێ ترکانە، نها برادەرەک ژ بەری ترکانڕە پەیدابیت و هون دگەل خوە ببات. پیچەک دن دهێت.

جیپ لەندرۆوێرەکە بەنێو بەردەڵانەکاندا ئەوەندە بە ئەملاو ئەولایدا دابووین، هەموو شان و پیل و سەر و ملمان ژانی دەکرد. تەهمینە دابەزی. بۆ ماوەیەک دەشەلی. لەبەر ژانی کەمەری کووڕ ببۆوە. لێرەدا نەمتوانی چاوی لەسەر هەڵبڕم. لە دواوەڕا تێیڕامام. بردمیەوە

بەر دەرگای تەسکی نێوان ماڵ و دووکانەکەی مەش بایرام. دیسان میزە ئاسنینەکەی بەردەم مەش بایرام لێم بۆوە بە ئەفسانەی کچی. تەهمینە ڕووی وەرسووڕاند و ئەمجارە لێم بوو بە ئەفسانەی خۆم. لە تەورێزەوە بەرەو ئەفسانەی خۆم گەڕامەوە. برژانگە چەترئاساکانت مەودای نێوان چاو و برۆتیان بەرزونزم دەکرد. چوومە نێو ڕەشێنەی چاوەکانتەوە. بەنێو ڕەهەندە هەراوەکانی چاوی ئەفسانەدا ڕێگەم لێ شێوایەوە. ڕەشێنەی چاوت لە پێشەوە تاقە خاڵێکی ڕەشە، کاتێک دەچیە نێوی بەسەر چەندین ڕەهەندی دیکەدا دابەش دەبیت. هەر ڕەهەندەو چەند ڕەهەندی دیکەی لێجیا دەبنەوە. ڕووەدەکەمە هەر کامیان خۆزیای ڕۆیشتن بەنێو ڕەهەندێکی دیکەدا تووشی دڕدۆنگیم دەکات. ڕەهەندێک هەڵم دەگرێت. خۆمی پێدادەکەم. لەسەر هەموو سێڕێیانێک بێئەوەی بە خواستی خۆم ڕێگە هەڵبژێرم، خۆم بە ڕەهەندێکی دیکەدا دەکەم. ئەرێ ئەفسانە تۆ بڵێی لەنێو ڕەهەندەکانی نێو ئەم گلێنە ڕەش و بێبنەدا بەکوێ بگەم؟ تۆ بڵێی ئەو چاوانە ئەوەندە قووڵ بن، هەرگیز نەگەمە کۆتایی؟ یان بەخۆمم نەزانیوە و لەنێو بازنەیەکی پڕلە ڕەهەنددا دەسووڕێمەوە؟

تەهمینە پەلی تووڕەجی خۆی بۆ پشت گابەردێک ڕادەکێشێت. نیگام لەسەر گابەردەکە وەخۆ دێتەوە. بە دۆڵ و کەڤر و ڕەوەزە ئاستەمەکاندا دەڕوانم. ئەفسانەکانم لێ ون دەبن. تەهمینەش وەک جنۆکەیە و لەم سەفەرە نادیارەدا خۆم پێشان دەدات و ون دەبێتەوە. دەڵێی بۆ ئەوە بۆتە هاوسەفەرم لە نێوان ئەفسانەکاندا بمهێنێت و بمبات. نانا، پێم وانییە هەرگیز تەهمینە ببێتە ئەفسانەی من.

دوو ئەفغانییەکان هەڵتووتەکاون و بە چیلکە نەرمانە عەردەکەی بەردەمیان خەتخەت دەکەن. ئاخۆ ئەوان ڕازی کام ئەفسانە لەسەر ڕێگەی نێوان وڵاتەکەیان و دووروەوڵاتیی ئاواتەکانیاندا دەکێشنەوە؟ تەهمینە دەچێتە پشت گابەردێکی بەرز و گەورە. دەستێکی بە ڕووکاری



لای خوارەوەی گابەردەکەوەیە و لاشانێک و لایەکی ڕوخساری لە ئێمەوە دیارە. هەست دەکەم بەشی هەرە زۆری لەشی لەودیو گابەردەکە لەبەردەستی تووڕەجدایە.

تووڕەج نەکەی بەریدەی! ڕەنگە تەهمینەش بۆتۆ ئەفسانە بێت. ئەوکاتانەی لەبەر دەستتدایە هی خۆتە. بەری بدەی، وەک ئەفسانەی من لە کیست دەچێت و تەنیا لە خەونەکانتدا تووشی دەبییەوە.

لە لاپاڵی چیاکەی سەرووممانەوە کەسێک بە نەرمەغار دێتە خوار. کابرای قاچاخچی بە لەپی دەست سێبەر دەخاتە سەر چاوەکانی و ماوەیەک بۆی دەڕوانێت:

– ئەڤە هات. ئەو زەلامێ بەرێ ترکانە. زەڵامەکێ گەلەک باشە. ئەو هون دگەل خوە ببات.

نزیک بۆوە. پیاوێکی تەمەن مامناوەندیی باریکەڵەیە. باریک و سووک. دەڵێی خوا بۆ هەڵبەزدابەزی نێو ئەم چیا و بەردەڵانە خوڵقاندوویەتی. بە گەرمی تۆقەی لەگەڵ قاچاخچییەکەی هاوڕێمان کرد و بە سیلەچاوێک سەیری من و دوو ئەفغانییەکەی کرد. لە دوورەوە بە دەوری تووڕەجدا سووڕا و کڕیارانە لە تەهمینەی ڕوانی. بەو شوێنەی پێیدا هاتبوو، پێشمان کەوت. لە کەژەکە ئاوا بووین و کەوتینە نێو دۆڵێکی قووڵ. دووبارە سەرکەوتینەوە. ئەفغانییەکان پێیان لە جێگە پێی کابرای قاچاخچی دادەنا. من لە نێو سووکە ترسێکدا بە هەستیارییەوە هەنگاوم دەنا. تووڕەج هەوڵ دەدات تەهمینە بەرەو بەرزاییەکە ڕاکێشێت. ئێمە لە کێوەکە ئاوابووین. کابرای قاچاخچی گوتی، ئێرە ڕاست سنووری نێوان ئێران و تورکیایە. جێگەی مەترسی نییە.

لەم کوێستانە بەرز و سازگارە، گوڵەمێلاقە لە هەموو شتێک زیاتر سەرنجم ڕادەکێشێت. شنەبایەک لە لای خۆرئاواوە دەشنێتەوە. بەهێزتر دەبێت و گوڵە مێلاقەکە دەلەرێنێتەوە. گوڵەکە بەچەشنێک دەلەرێتەوە،

دەڵێی لە مەودای سێچوار سانتیمەتردا رایدەوەشێنن. لەم مەودایەدا خەتێکی کورتی شەپۆلدار دروست دەکات. خەتەکە دەڵێی ژێی کەوانە دەلەرێتەوە. کاتێک بایەکە هێدی دەبێت، خەتەکەش کورتتر دەبێتەوە و شەپۆلەکانی زەقتر. بایەکە بە تەواوی دەوەستێت و گوڵە مێلاقەکە لە مەودای نێوان لەرینەوە و وەستاندا دەڵێی دەنکی هەنارە. هەنارێکی سوور وەک دەنکە یاقووت. لەنێو داوی ئەفسانەکاندا خەریکە یاقووتی نێو هەناریش سەرنجم رادەکێشێت. ئەو هەنارەی ئێستاشی لەگەڵدا بێت، تامم نەکرد. ئەو هەنارەی تەنیا لەبەر جیاوازیی بیروبۆچوونی لە هاوسەرەکەی دابڕابوو. ئەو هەنارەی ئێستاشی لەگەڵ دابێت نەمزانی ترشە، شیرینە یان مێوخۆشە.

قاچاخچییەکە لە نەرمانی دووندی بەرزاییەکەدا دوو چڵە کەمای پێشانماندا و تێیگەیاندین ئەوەی یەکەم لە خاکی ئێراندا روواوە. چڵە کەماکان باڵیان بۆ یەکتر هاویشتووە و دەستەملانی یەکترین. جۆڵاتەنەیەک بە تەونێکی ورد چەند لقێکی کەماکانی بە یەکترییەوە بەستۆتەوە و دەڵێی لەم مەودا کەمەدا راوی مێشوولەی سەرگەردان دەکات. کابرای قاچاخچی تێیگەیاندین تا تاریکان دادێت، لێرەین و خۆی بە دوای توورەج و تەهمینەدا گەڕایەوە. دوو ئەفغانییەکە نەوینە سەر تەونەکە و جۆڵاتەنەکەیان دیتەوە.

– تەمەشای، دەڵێی هەزارەیە لە پەسیوی پشت ئەم چڵە بچووکەدا خۆی مەڵاسداوە.

– بۆ ناڵێی «پەشتوون»ە و خەریکە داوێک بۆ «هەزارە»کان دەنێتەوە؟

– نەخێر، ئەوە ڕاست خۆمم، بەزۆر دەمهەوێ سنووری ئێران و ئەفغانستان بەیەکەوە ببەستمەوە.

بە نێو شەڕی چەندساڵەی هەزارە و پەشتوونەکانی ئەفغانستاندا



دەسوورێمەوە. بەوردی گوێ بۆ هەواڵەکانی سوپای سوور لە خاکی ئەفغانستان شل دەکەم. تەلەفزیۆن پاشەکشەی تانک و ماشێنە سەربازییەکانی سۆڤیەت پێشان دەدات. ئاغام دەڵێت ئەمجارە لە ئەفغانستان خولێکی تازەی شەڕ و پێکدادان دەست پێدەکاتەوە. لەمەودوا سەربازی کۆمۆنیست لەوێ نامێنن. ئەمجارە موجاهیدە ئەفغانەکان دەوڵەتی ئیسلامی دادەمەزرێنن. تازە ئەفغانستان هەتاهەتایە چاوی بە کۆمۆنیستەکان ناکەوێتەوە. ئاغام هەمووجارێ کە میوانی دەهاتن، پێیخۆش بوو ئەم باسە دامەزرێنێت کە چۆن موسڵمانەکان شەرق و غەرب تەرتوتونا دەکەن و ئینقلابی ئیسلامی هەموو جیهانی ئیسلام دادەگرێت و ئەم ئینقلابە هەناردەی هەموو جیهان دەکرێت. ئاغام فشەی بە کۆنە کۆمۆنیستەکانی تەورێزیش دەهات و قسەکانی مەش بایرامیشی پێخۆش نەبوو. مەش بایرام لە دەرفەتێک دەگەڕابە خێر و خۆشییەکانی سەردەمی پاشایەتیدا هەڵبلێت. ئاغام دەیگوت, شا پیاوی ئەمریکا بوو و بابرەک کارمەلی سەرۆکی ئەفغانستانیش پیاوی رووسەکان بوو. لە ئەفغانستان ڕۆژهەڵات تێکشکا و لە ئێرانیش ڕۆژئاوا. رێگەی قودسیش لە کەربەلاوە تێدەپەڕێت.

غەڵبەغەڵبی توورەج و کابرای قاچاخچی و تەهمینە لەودیو تەپۆڵکەکەی دواوەمان بەسەر تەپ و توانجی دوو ئەفغانییەکەدا زاڵ دەبێت. لەودیو گردەکەشەوە دەنگی تەهمینە دیارە و لەنێو دەنگی تەهمینەشدا رەگێک لە دەنگی ئەفسانە بەدی دەکەم. سەری توورەج لێمان وەدیار دەکەوێت. بەزۆر تەهمینە بەرەو ئێمە رادەکێشێت. ئێمەیان لێ وەدیار دەکەوێت و کابرای قاچاخچی دەستەکەی دیکەی تەهمینە بەردەدات. تەهمینە و توورەج وەک ئەوەی هەر دووبەدوو لەو چۆڵەوانییە دابن، خۆیان داوێنە باوەشی یەکتر. دەڵێی پاش دابڕانێکی زۆر یەکتریان دۆزیوەتەوە. یەکتر بە خۆوە دەگوشن و بە بەری دەست نێوشانی یەکتر دەلاوێننەوە. لێرەدا

وەک ژن و مێرد یان وەک دوو ئەویندار ناچن، دەڵێی دوو هاوڕێی گیانی گیانین و لە مەترسییەک ڕزگاریان بووە و بە بۆنەی ئەم ڕزگاربوونە، یەکتری لەباوەش دەگرن. دەڵێی دوو هاوڕێی دەورانی بەندیخانە یان دوو کۆنەسەربازی بەرەی شەڕە نەخوازراوەکانن. دەڵێی دوو یاری کۆنی سەردەمی قوتابخانەن و دوای چەندین ساڵ یەکتریان دۆزیوەتەوە. دەستی چەپی تەهمینە نێوقەدی تووڕەج ڕێکدەگوشێت و بەری دەستی ڕاستی ڕێک نێوان هەردوو شانی دەلاوێنێتەوە.

دەستی ڕاستم لە نێوان هەردوو شانتدا کەوتە ژێر قژەکانت و خەریک بوو دەستی چەپم ئاوقای کەمەرت بێت.

– بەرمدە، دایە مەرجان هات!

زۆر پێش ئەوە، دوای یەکەم دیداری نێو پارکەکە بەڵێنیتدا بە دایە مەرجانم بناسێنی. نازانم بۆ لەم کاتە هەستیارەدا ئێمەی دیت؟ باشبوو پێش ئەوەی بمانبینێت، تۆ هەستت کرد. پێم وابێت لە چەند دیدارەکەی بەر لە ناساندنی من بە دایە مەرجان، لە دەربڕینی خۆشەویستییەکە پەلەمان کردبوو. ئێستا بۆیە وادەڵێم، تەنیا دەمهەوێ ئەوا خۆم پێشان بدەم، دەنا ئەوەی ڕاستی بێت ئەوکات پەلەم دەکرد و هەر کورتەساتێکم لێ دەبوو بەساڵێک. من پیاوی دان پێداهێنان و ئیعترافم. سەیریکە، ئێرە سەدان کیلۆمیتر لە شاری گێلاساوا دوورە. تۆ لەوێ و من لێرە، ناتوانم درۆت لەگەڵدا بکەم. ئەوکات من زۆر لە دەربڕینی خۆشەویستییەکەمان پەلەم دەکرد. ڕەنگە پەلەش نەبێت، ڕۆژی یەکەم کە هاتم بۆ ئیدارەکەتان، ئەم هەستەم لەخۆمدا بەدی کرد. تۆش بەچاوانتەوە دیاربوو ئاگاداری ئەم هەستەی منی. زۆر جار نیگای دووکەس لە بێدەنگیدا یەکتر دەنگێون. لەمکاتەدا ئەگەر دڵی هەردووکیان دابخورپێت، هیچ پێویست ناکات بەیت و باو بۆ یەکتری بهێننەوە. بێئەوەی هەوڵی زۆری بۆ بدەن ئەو دوو دڵەی هاوکات داخورپاون، پێکەوە دەلکێن و لە یەکتر موتوربە دەبن.



– دایە مەرجان، ئەمە ئەو پیاوەیە بۆم باس کردبووی. ناوی کاک ڕەزایە. خەڵکی تەورێزە. دەڵێ پێمخۆشە باش فێری کوردی بم. بە منداڵی لەگەڵ باوکی دووساڵ لێرە ژیاوە و کوردی فێربووە. قەرارە من فێری خوێندنەوە و نووسینی کوردی بکەم. لەلایەک خەڵکی تەورێزە و لەلایەکی دیکە لێرە دوای میراتی باوکی کەوتووە و دەڵێ زەویان لێ داگیر کراوە. پێی خۆش بوو تۆش ببینێت.

– بەخێربێتن، ماڵە خۆیەتی.

– مەمنوون دایە مەرجان. لە ئیدارەی کشاوەرزی با ئەفسانەخانوم ئاشنا بووم. خانمێکی زۆر موهتەرەمە. پێم خۆش بوو با ئێوەش ئاشنا بم.

– بەخێر بێی، سەرچاوم. ئەمەش خۆشحاڵین.

دەمهەویست نەهێڵم دایە مەرجان هەست بکات پێشتر ئەم ژوورەم دیتووە. نازانم بۆئەوا خێرا ئەم ماڵەت لێکردم بە قوتابخانەی زمانزانی و دڵداری. قوتابخانەیەک مامۆستاکەی ئەفسانەی زمان و جوانی و دڵدارییە. نابێ دایە مەرجان بە هیچ شێوەیەک هەست بکات لە ماوەی ئەم چەند ڕۆژەدا هاتوومەتە ئەم ماڵە.

نەمزانی بۆ پێتخۆش نەبوو، دایە مەرجان ئەوا بە ڕاشکاوی و بێپێشەکی دەست بە گێڕانەوەی ژیانی خۆی بکات. بە ئیشارە کێشاتە ئاشپەزخانەکە و بەدەنگێکی نزمەوە پێت گوت دایەگیان، پێشان تۆ بەوردی پرسیاری لێبکە و پاشان پرێسکەی دڵتی لا بکەوە. ڕەنگە ویستبێتت لای دایە مەرجان وا پێشان بدەی تەنیا وەک ئەو دەمناسی و هیچ کەینە و بەینەیەکمان لە نێواندا نییە.

– یاخوا بەخێر بێی سەر هەرتک چاوی دایکی خۆت. باشە چۆنە ماڵو لە تەورێزییە و لێرە داوای میراتی بابت دەکەی؟

– چۆن بۆت بگێڕمەوە، دایە؟ داستانی من زۆر موفەسەلە، کوا

هەوسەلەتان دەبێت لە بیخەوە بیگێڕمەوە. با سەرتان بەدەرد نەهێنم.

– نانا، ئەمن زۆر داستانی سەیر و سەمەرەم بیستوونە. زۆریشم پێخۆشە. فەرموو.

– من ئیبتدای زیندەگی خۆم باش لە یادم نییە.

– بەڵێ...

– ماڵمان لە تەبریز لە محەللەی نەوبارە. ئاغام ناوی سەففەرعەلی بلوت ئۆغڵوویە و ئەو و مامانم لە خۆم زیاتر فەرزەندی دیکەیان نییە. ئاغام دووسال گەبل ئەز ئنگلابی ٥٧ی ئیران دێتە ئەم مەنتەگەیە و لە دێیەک دەبێت بە سوپاهی دانیش.

– دەی...

– من کەمێک لەبارەی سوپاهیانی دانش ئیتلائاتم هەیە، ئەمما زۆر کەمە.

– ئائا، ئەمنیش سوپای دانیشم لەبیرن. لە جیاتی دوو ساڵ سەربازیکردن، دەرسیان بە منداڵان دەکوتەوە.

– ئاغام دەیگوت، ئەو زەمان من سنم شەش سال بووە. منی لەگەل خۆیدا بۆ ئێرە هیناوە. سالی ئەڤەل و دوڤوم ئیبتدایی لە روستاکەی ئێرە خوێندوومە.

– ئاغات دایکتی دەگەڵە خۆی هێنابوو بۆ ئێرە؟

– ئاغام دەیگوت، مامانت حازر نەبوو لەگەڵ من بێت بۆ کوردستان. منیش لە هەیفی ئەو، وەگتی تەئتیلات کە دەگەڕامەوە تەبریز، تۆم لەمالی کەسێک بە نێوی مام میرۆ دادەنا و نەمدەبردییەوە بۆ تەبریز.

– ئەیرۆ پیاو چەندە زاڵمن! دەی...؟

– مامان دەیگوتەوە کورەکەم بیهێنە و ئاغاش دەیگوتەوە ئەگەر تو بۆ کوردستان نەیەی، من تا ئاخری مودەتی سپاهی دانشم ئیزا ناهێنمەوە بە تەبریز.



– دووساڵی عەلەنتەواو نەیهێشت دایکت بدبینیتن؟

– وەگتی کێ ئاخری ڕۆیشتین بۆ تەبریز، من هەر دەمزانی بە کوردی گسە بکەم. مامان وەگتێک منی دیتەوە زۆر خۆشی لێمهات.

– ئەدی باشە لەبیرت نییە پێش ئەوەی بچییە مەدرەسەی، دەگەڵ مامانت بووی یان نا؟

– نا، من وەک خاب دیدەن لەبیرمە. پێموابی پێش مەدرەسە نازانم نە هەر وەگتی دەرس خاندەن بوو، هەر لەو روستایە لەگەل مندالان بازیم دەکرد و ئەوڕۆژە هەموو مندالان چوین بۆ مەدرەسە. من زۆر زرەنگ بووم. ئاغام منی ماچ کرد. نا، پێشتر مامانم لەبیرم نییە. ئاغام لە هەساری مالی مام میرۆ لە ئوتاغێکی کوچکدا دەما. منیش هەر لای مام میرۆ بووم.

– ئەدی مام میرۆ ژنی نەبوو؟

– نا، دەیانگوت ژنی مام میرۆ میردووە. ئاخری مودەتی کاری ئاغام لەوێ تەواو بوو. ڕۆیشتینەوە بۆ تەبریز.

– ئەگەر چوویەوە مامانت زۆر خۆشحاڵ بوو؟

– مامان منی لە ئاغوش گرتەوە. زۆر خۆشهال بوو، ئەمما من نەمتوانی بە تورکی گسە بکەم. مودەتێک هەر بەفارسی لەگەڵ مامان گسەمان دەکرد. من فارسی لە مەدرەسەی روستاکە فێر بووم، ئەویش کەمم دەزانی. لە یادمە باش نەمدەزانی گسە بکەم. بە زمانی ئازەری گسەم کردەوە. مامان دەیگوت زەبانی مادەری خۆشترە.

– لەماوەی ئەو چەند ساڵەدا نەهاتیتیەوە ئێرە؟

– لەدوای ئەوە گەراینەوە تەبریز، ئینگلاب بوو. لە تەبریز چووم بۆ مەدرەسە و بەعدەن ڕۆیشتم بۆ دانشگاهـ لە تەربیەت موئەلیم خوێندم و بووم بە موئەلیم.

– پێت خۆش نەبوو سەر لەو گوندە بدەیەوە؟

– زۆر پێم خۆش بوو. ئەمما دوای ئینگلابی ٢٢ی بەهمەن[١]، لە تەبریز ئەنواع ئەخباری خەتەرناکیان دەگوتەوە. دەیانگوتەوە لە کوردستان زیددی ئینگلاب خەلکان ئەزییەت دەکاتەوە. رەهم بە کەس ناکاتەوە. جاری وابوو ئاغام دەیگوت ئەفرادی موسەللەهی کۆمیتەی ئینگلاب لە سەر جادەکان بازدیدی خەلک دەکەن و جەوانەکان دەگرنەوە. دەلێن ئیهتماله هەمکاری زددی ئینگلاب بکەن. مامان دەیگوت ناهیلم کوری خۆم بچیت بۆ کوردستان، زۆر خەتەرە. ئاغام دەیگوت ئیزاجان پێت خۆشە بچین بۆ ئەو مەدرەسەیە سالی ئەڤەل و دوڤوم ئیبتدایی لەوێ بووین؟ من پێمخۆش بوو بێمەوە، ئەمما مامان دەیگوتەوە ناهێلم کوری خوم بچیت کوردستان، زۆر خەتەرە.

– ئێستا لە تەورێز چ کارەکی دەکەی؟

– ئیستخدامی ئاموزش و پەروەرشم. مودەتێکە لە مەدرەسەیەک موئەلیمم.

– ئەدی چلۆن بوو رێت کەوتەوە ئێرە؟

– ئیهتماله خۆشم نەزانم. ئاخر دەلێم زیاتر نارەحەتتان نەکەم.

– نانا، فەرموو.

– دوای ئەوەی تەربیەت موئەللمم خاند، ئاغام پێیخۆش بوو ئیزدواج بکەم. لەگەڵ کچی هەمسایەکمان لە کوچەکەی خۆمان ئاشنا بووم. هەم دایک و بابای کچەکە و هەم ئاغام پێیان خۆش بوو. ئەمما مامان موخالفەتی کرد.

– ئەیەرۆ جا لەبەر چی؟ کچەی بەدڵ نەبوو؟

– نەخێر، یەک شەو مالی کچەکە هەموویان لە ماڵی ئیمە بوون. هەموومان دانیشتبووین. ئاغام سەری گسەی کرد. یەکڕاست دیتم مامان پێی ناخۆشە. مامان بە نەوئێک خۆی نیشاندا کە موخالفی ئەم

١- ١٩٧٩/٢/١١زایینی



وەسلەتەیە. ئاغام زوو تەواوی کرد و میوانەکان ڕۆیشتن. دوو ڕۆژ گوزەشت. لە ئوتاغەکەی خۆم بووم، ئاگام لیبوو ئاغا و مامان دەرگیر بوون. مامان توند هـاواری کرد و گوتی ئەم دەفعەیە پێی دەلیمەوە کوری خومان نییە. ئەتوو بە زۆر بە تەمای ئیزا بیژی بکەی بە کوری ئی خۆمان. ئەوان بێدەنگ بوون و من تا سوبهـ خاب نەیبردمەوە. زۆر زۆر نارەحەت بوومەوە.

– باشە ئەدی ئەوە چ رەبتێکی بە میراتی مام میرۆوە هەیە؟

– من دەمزانی مام میرۆ کەسی نییە. نە ژنی هەیە و نە میندال. گوتم دەچم دەلێم من کوری مام میرۆم و داوای میراسەکەی دەکەم. ئاغام مام میرۆی یادی ئەمن هینایەوە.

– باشە خۆ زەحمەتە هیچت بۆ بچێتە سەرێ.

– ڕاستە، ئەمما پێم خۆشە لەم شارە بمینم و دەلێم ئیهتماله لێرە سەرەنەخێک پەیدا بکەم. تازە لە تەبریز هەموو کەس پێم دەلێن ئیزا بیژی....

– باشە بۆ دەگری؟ کاکە رەزا گیان گریانی پێناوێتن! چارەنووس و زیندەگی مەش لە ئی تو سەیر و سەمەرەترە. ئەوەندەش نارەحەت مەبە. ئەگەر بتهەوێتن لێرە بمێنییەوە، دایکی خۆت ئەوەندەی لە دەستی بێت، کۆمەگت دەکاتن.

دایە مەرجان، چاوێکی لە تۆ کرد و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا. وێدەچوو پێی خۆش نەبێت چی دیکە پرسیارم لێبکات. دەتگوت لەم پرسیارانەی کردبووشی پەشیمان بۆتەوە. هەستم کرد هەردوو لاشانی زیاتر داکەوتوون و لە کاتی سەرەتای ئەم چاوپێککەوتنەمان بە تەمەنتر دیار دەکات. لەم نیونگایەی تۆشەوە ترسێک لەدڵم نیشت. نەکا ئەفسانە پشت لە بێدەرەتانیی من بکات و بەیەکجاری رووم لێوەربگێڕێت؟ دەترسام لێڕەش ناوی رەزا بیژوو لەکۆڵم نەبێتەوە. ئەم ئەفسانەیە

پێچەوانەی ئەفسانەی مەش بایرام لە ناوی ڕەزا بیژوو بێزار بێت و لەمەودوا لام لێنەکاتەوە.

❊ ❊ ❊

هەرچەند خۆم لە دیتنی تەهمینە دەدزییەوە، دەتگوت سیحرێک سەرنجی چاوەکانم بەدوای ئەودا ڕادەکێشێت. لە قووڵایی دڵمەوە هەستم بەم ترسە دەکرد کە تەهمینە و توورەجی داگرتبوو. لە دەروونی خۆمدا دەمگوت، هیچ تەماعێکم لە تەهمینەدا نییە و پێمخۆشە ئەوەندەی لەدەستیشم بێت، لەم چیاو چۆڵانەدا یارمەتیدەریان بم.

دوو کوڕە ئەفغانییەکە سەرەڕای ئەوەی هێندێک جار بە تەوس و پێکەنینەوە دەیانکردە شەڕی پەشتوون و هەزارەکان، لەسەریەک پێکەوە تەبابوون. بەڕوخساریانەوە دیاربوو حەز ناکەن نە تەهمینەی هاوسەفەریان تووشی کێشە بێت و نە دڵی توورەجیش ئازاری پێبگات. دیارە لەبەر ئەوەی من زمانی کابرای قاچاخچیم دەزانی، لەگەڵمدا زۆر ڕووخۆش بوون. ئەفغانییەکان دەتگوت لە وڵاتێکەوە هاتوون هیچ شەڕوشوورێکی بەخۆیەوە نەدیوە. لەو وەختەوە دوو کوڕە ئەفغانییەکەم ئەوا بە تەبایی دەدیت، ئەم بڕوایە لام بەهێز دەبوو کە ڕەنگە وڵاتەکەیان هیچ کێشەیەکی تێدا نەبێت و ئەوەی لەبارەی ئەم وڵاتەوە بیستوومە و دەیبیسم، هەمووی درۆ و دەلەسەی میدیاکانە و ئەوێ ئەوەندە ئارامە گورگ و مەڕ لە دەراوێکدا تینوێتییان دەشکێنن. ئاخر ئەم هەتیوانە ئەوەندە گەش و ڕووخۆش بوون، ئازاری هیچ شەڕ و شوورێکیان پێوە دیارنەبوو.

ڕۆحی ئەفسانە لە جێگەی ڕۆحی تەهمینە دادەنێم. بۆم ناکرێت. کوا دەکرێت ڕۆحی کەسێک لە جەندەکێکی نائاشنادا زیندانی بکەی؟ ڕۆحی ئەفسانە لە جەندەکی تەهمینەدا خۆی پێڕاناگیرێت و لە شەقەی شاباڵی دەدات. هەرچەندە تەهمینە بە دیمەن جوان و دڵڕفێنە، بەڵام ئەم قەڵافەتە ناتوانێ ببێتە خانەخوێی دڵی ئەفسانەی من. ڕۆحی ئەفسانە ڕۆحێکە



تەنیا لەو لەشەدا ئۆقرە دەگرێت کە شایانی ئەوەیە بۆ هەمیشە ببێت بە خانەخوێی. ڕۆحی ئەفسانە دەگەڕێت و وەک پەڕکورێکی خاوەنی دوو شاباڵی بەهێز، لە بەرزایی چیا و ڕەوەز و کەڤر و دارستانەکانەوە بەرەو زەوی دەڕوانێت. کاتێک دادەبەزێت، دەبێتە باڵندەیەکی بچووکی خۆشڕەوت و جارێکی دیکە پەیکەری ئەفسانە دەبینێتەوە و خۆی پێدادەکاتەوە. هەرکە چاوم بە تەهمینە دەکەوێت، لەگەڵ ڕۆحە وێڵ و سەرگەردانەکەدا بەرەو پەیکەری ئەفسانە دەفڕمەوە.

تەهمینە دادەنیشێتە سەر بەردێک. بەردەکە کونجیکونجی و گرنیگرنییە و واکەوتووە ناچارە بەرەو قاچاخچییەکە لەسەری دانیشێت. قاچاخچییەکە کاتێک ڕووی لە ئێمە وەردەگێڕێت و ڕوو دەکاتە تەهمینە، ڕوخساری دەگۆڕێت و دەبێتە پیاوێکی مێهرەبان و دڵئاوەڵا. پڕ بەدڵ توورە دەبم. قاچاخچییەکە چەندە پیاوێکی ڕەزاسووک و لەبەردڵانە؟ تەهمینە چاو دەگێڕێت. بەردێکی لووسی وەک کورسی بەرانبەریەتی. لەسەری دادەنیشێت. ڕێک بەرانبەرمە. قاچاخچییەکە ڕوخساری دەگۆڕێت و دەبێتەوە ئەوپیاوە ڕەزاگرانەی لەبەرانبەر زۆربەی پرسیارەکانماندا خۆی کەڕ دەکات.

ژنان هەر چەند قەڵافەتیان جیاواز بێت و بەشێک لە سەر و ئەندامیان ناشیرین بێت، جوانییەک هەموویان کۆ دەکاتەوە. ناشیرینترین ژنیش لەم جوانییە بێبەش نییە. ئەم جوانییە لە جەوهەر و ڕۆحی هەموو ژنێکدایە. جوانییەکە ئەوەندە جوانە، هەموو ناشیرینییەکان دادەپۆشێت. ڕەنگە نەکرێ ناوی لێبنێی جوانی. شتێکی سەرنجڕاکێشە تەنیا لە دایک و خوشک و هاوسەر و کچ و هەموو ژنان و کچانی دوور و نزیکدا بە ڕێژەی جیاواز بەدی دەکرێت. من ئەم شتە لە هیچ پیاوێکدا بەدی ناکەم و هیچ ڕستەیەکیش شک نابەم بتوانێت ئەم تایبەتمەندییە دەرببڕێت. تەهمینە وێڕای ئەوەی لەم جوانییە بێبەش نییە، لەگەڵ ئەفسانەی من

دەڵێی سێوێکن و دوولەتت کردووە. دوولەتی چی؟ سێ لەت. سێ سێو...، چوار سێو، پێنج، شەش... باغی سێوان. دوو سێوە سپییەکەی نێو دەفرەکەی ماڵی سەفەرعەلی بلۆت ئوغلۆو لە بەردەم ئەفسانەی مەش بایرامن. قەولە بێتە باغی سێوان/ وەختە شێتبم بچمە کێوان. کێو... ئەوە نییە لە کێوانم؟ بەڵام شێت نیم. ها؟ کێ دەڵێ شێت نیم؟ شێتان... تەهمین... ئەفسا... قاچاخچی... دایەبایرام... ماسی... نەوبار... مەش مەرجان بەرم دە.

خۆیەتی. ڕاست خۆیەتی. ئێستا هەرکەس ئەفسانەی دیتبێ، بڕوام پێ ناکات بڵێم ئەمە ئەفسانە نییە و تەهمینەیە. چۆن وادەبێت، هەرچی من بیگەمێ ئەفسانە بێت؟ ئەمەیان تەهمینەیە. لەسەر ئەم بەردە لێک و لووسە لەبەرانبەرمدا دانیشتووە. گوڵەکەم! ئێستێ لەبەر ئەم خۆرەتاو و گژەبا ساردە نەبوایە لەچکەکەت لەسەر و ملت دەکردەوە. وا نەکەی؟ با بەتەواوی نەبی بە ئەفسانە. با لەچکەکەت با نەیبات. بردی... تووڕەج بەدوای لەچکەکەدا ڕادەکات. تووڕەج لەم بەرەو هەورازە ماندووە. پشووی سوارە. تەهمینە هەروا ئەفسانەیە. چۆن سوپاسی ئەم گەردەلوولە بچووکە بکەم؟ دەتگوت هەست بە ئارەزووی نێودڵی من دەکات. وەک فێر کرابێت، پڕی دایە لەچکەکە و بردی.

ئەفسانە گیان سەرت هەڵبێنە. تا دایە مەرجان دێتەوە تێر سەیرم کە! چۆن من هەست دەکەم لە ناو دڵی تۆدام، تۆش هەر ئەوا هەست دەکەی من ئاگاداری هەموو دڵەڕاوکێکانی تۆم. دەزانم دڵت بە نەرمی بەرەومن لێدەدات و ئیدی گەرای خۆشویستنی من لە دڵی تۆشدا مەییوە.

سەگباب! کوێڕا هێناتەوە؟ ئەوە بۆ بەسەر تاشە بەردێکدا نەکەوتی؟ ئەفسانە لەچکەکە دەکاتە سەری و دەبێتەوە بە تەهمینە. ئەرێ ڕەزا ئەوە بۆ زمانت شڕ بووە؟ نا من زمانشڕنیم. ئەمجارەیان لە دڵی خۆمدا جنێوم دا، بەڵام ئامادەم بە ئاشکرا داوای لێبوردنت لێبکەم تووڕەج.



ئەگەر لەچکەکەت نەگەیاندبایەوە تەهمینە، هاوارم دەکرد هۆی ئەفسانە. هەر باش بوو زوو هێناتەوە.

هەر ئەوەندەیە تاریکانمان بەسەردا بێت. تا دەگەینە ئاوەدانی، ڕەنگە قاچاخچییەکە تەنیا بتوانێت چەند جارێک لە تاریکیدا دەست لە لەشی تەهمینە بکوتێت. لەچکەی تەهمینە بەدەست تووڕەجەوە دەتگوت لەچکەکەی دایە مەرجانە. لە دەستی ئەودا وەک لەچکەی دایە مەرجان دەچوو. ئەی بۆ لەسەری تەهمینەدا وا نییە؟ لەسەری تەهمینەدا وەک لەچک نامێنێتەوە و دەبێت بە خەرمانەی دەوری مانگی ڕوخساری. نا ئەوەی دایە مەرجان کەمێک گەورەتر و ڕەنگی تارتر بوو. بۆ جاری دووەم کە دایە مەرجانم دەدیت ئەم لەچکەیەی بەسەرەوە بوو. وەبزانە هەر ئێستایە. ئەگەر لەچکەکەی تەهمینە با نەیبردبایە، لەم کاتەدا دایە مەرجانم نەدەهاتەوە یاد.

تەمەن چەندە خێرا دەڕوات؟ ئەوە چوار پێنج ساڵ تێدەپەڕێت و وادەزانم ئێستا دایە مەرجان بەم لەچکەیەوە لەسەر دۆشەکچە بەرانبەرم پاڵی وە پشتییە مافوورچنەکە داوە.

– ئەفسانە خانم ببەخشە ئەم ئەکسەی لە سەر میزی تەلویزیۆنەکەیە، ئاغاتانە؟

بێدەنگییەکەت لەم پرسیارەم پەشیمانی کردمەوە. خۆزگە ئەم پرسیارەم نەکردبایە. لە ماوەی ئاشنابوونماندا ئەوە یەکەم جارە ئەم چەشنە گرژییە بە ڕوخسارتەوە دەبینم. هەر لە یەکەم جاری هاتنم بۆ ماڵی ئێوە هەستم کردبوو باوکت نەماوە، بەڵام نازانم بۆ لەمبارەیەوە پرسیارم نەکرد و تۆش هەر بەلای ئەم باسەدا نەچووی. کاتێک ئەم پرسیارەم ئەوا کاری تێکردی، زۆر ناڕەحەت بووم. دەتگوت دایە مەرجان ئاگاداری ئەم دەغدەغە و دڵەڕاوکێیەی دەروونی من وتۆیە.

– کاکە ڕەزا گیان وەرە لای دایکی خۆت ڕۆنیشە.

بیرم بەلای ئەو وێنەیەوە چوو، ئەورۆژە لەسەر کتێبخانە بچووکەکەی ژوورەکەی تۆ بە تۆڕێکی تەنک داپۆشرابوو. دایە مەرجان لەژێرەوە خێسەیەکی دایکانەی لە تۆ کرد. ئاماژەی بۆ وێنەکەی تەنیشت تەلەفزیۆنەکە کرد:

– ئەوە پیاوەکەمە، لە شەڕێکدا بە دەستڕێژی گوللە گیانی لەدەست دا.

– شەهیدە؟ لە جبهەی جنوب شەهید بووە؟

– نا، لێرە لە شارەکەی خۆمان کوژرا؟

– خودا بە رەحمەتیان بکات، یانی لە دەرگیری لەگەڵ زیددی ئینگلابدا شەهید بووە؟ ئەنگۆ خانەوادەی موعەزەمی شوهەدان؟

دایە مەرجان چاوێکی لە تۆ کرد و پاشان بە شێنەیی، وردەوردە وەڵامی پرسیارەکانی منی دایەوە.

– بەڵێ کاکە رەزا، ئێمە خانەوادەی موعەزەمین. مێردەکەم وەک خۆت دەڵێی لە شەڕ لەگەڵ زیددی ئینقلابدا کوژرا و ماینەوە ئەمن و ئەو کچۆڵەیەم. دەوڵەت ئەو خانوویەی بۆ چاکردین و شەهیدانەشمان دەداتێ. ئەفسانەشیان زوو لە ئیدارەی کەشاوەرزی دامەزراند.

– خودا بە رەحمەتی بکات. ببەخشن من بە ئەو سوئالەم بومە بائسی نارەهەتیتان.

– نا بابم گیان، ئەوە چارەنووسە. بڵێین چی؟ ئەدی کاکە رەزا هەتا ئەلحان تۆ چت کردووە. بە تەمای چ بکەی؟

– دەلێم لەم تابستانەدا بچم بۆ تەبریز و ئەگەر بتوانم ئینتقالی وەربگرم و بێمەوە. لێرە وەزیفەی موئەلمییەکەم ئەنجام دەدەم. دەبی لەپێشدا لیرە بۆخۆم ماڵێک کرایە بکەم.

– باشە بۆ ماڵیش خوا کەریمە.

– زۆر مەمنوون دایە مەرجان. با بیزانم. هەرچۆنێک بێت پێمخۆش نییە لە تەبریز بم.



– ئەدی ئێستا لێرە لە ماڵە کێی؟

– لە موسافرخانەم. دەلێم بەلکە کاری دادگای زەمینەکەم تەواو بێت.

– ئەیەڕۆ جا لێرە بۆ لە موسافیرخانەی؟ ئەوە نییە دایکی خۆت لێرەیە؟ بە خودای نایەڵم لە موسافیرخانەی بی. ئەو هەموو جێ و رێیەن هەیە. ئەوە دووسێ دیو بەتاڵن. تەبەقەی خوارێ هەر چۆڵە، کەسی تێدا نییە. چەند ڕۆژە لەوێی؟

– نزیکەی دوو هەفتەیە. تەشەکور دەکەم. موزاحیمتان نابم. چەند روزی دیگەر دەبی بگەرێمەوە تەبریز.

– ناهێڵم لەوێ بی. ئەلحان ئیسراحەت بکە و دوایە بچوو لەوێندەرێ جلک و شتەکانت هەڵگرە وەرە ماڵە دایکی خۆت.

ئاوڕم دایەوە. تا لەسیلەی کۆڵانەکە ئاوا بووم، سەرت بە تەنیشت تای دەروازەکەدا بەدەرەوە بوو. بەرەو تاقە میوانخانەی شار هەڵکشام. پێش ئەوەی لە ئاخری بڵوارەکە بسووڕێمەوە، لەدەستی ڕاستمەوە پیاوێکی بەداروباری چوارشانەی بەتەمەن لە پشت میزی دووکانێکی لاستیک فرۆشیی ئۆتۆمبێل دانیشتووە. دەڵێی پێشترێ دیتوومە. ڕاست بۆخۆیەتی. ناوەکەی لەسەر زمانمە. ئای ئەوە بۆ بیرم نایەتەوە؟ خۆیەتی. میرزا مەحموود.

رەزای بولۆتئۆغلوو! مەودای دابڕان وەک بارستا گڵی سەر گۆڕی مردوویە، هەتا کۆنتر بێت، مەیلبڕترە. وەک ئەوەیە خۆشەویستێکت بمرێت و لە گۆڕستانێک خۆڵی وەسەرکەن. وردە وردە مەیلی دەنێی و لەبیری دەکەی. لێرە بمێنەوە. زەمەنی دابڕان وەک ئەو بارستا گڵە ژیانی ئەم چەند ساڵەی ئێرەی لەبیر بردوویەتەوە. باشە رەزا، ئەوە نییە لە تەورێزیش دابڕایەوە؟ بڵێی مەودای نێوان ئێرە و ئەوێش هەر وەک ئەو بارستا خۆڵەی سەر گۆڕی مردوو بێت؟ لێرە لە تونجەلیش بڵێی تەورێز و شاری گێلاساوا وەک گۆڕی مردوو بارستایی خۆڵی فەرامۆشیان

بکەویتەسەر؟ مەترسێ، لەچی دەترسی؟ ئەوە نییە یەک یەک ئەوانەی ئەودیوی مەوداکان زیندوو دەکەیەوە؟

سەر لە ئێوارەی دوێنێ، کرێوە بەفرەکە رۆمرکابوو. بەفری سەربانەکان ماشترابوون و کۆلانەکانیان لەگەڵ پەلەسوانەی تەویلە و کادێنە نەویەکان رێک کردبوو. کتێبەکانمان بە لاستیکی باریک لێکبەستبوون. توند بەباوەشمانەوە دەگوشین.

ئەفسانە دەڵێ کتێب هاورێی هەمیشەمە. ئەوکتێبانەی ئەفسانە بەرۆژنامە بەرگی دەکردن و دەیدا بەمن بیانخوێنمەوە، من و ئەفسانەیان بۆ هەمیشە لەیەکتر متوربە کرد. ئەوە چەقۆی چ باغەوانێکی شارەزا بوو من و تۆی وا لێک متوربە کرد؟ بێئەوەی هەست بەبرینی جێ نووکی چەقۆیەکە بکەین، بەم چەشنە خوێن و گۆشتمان تێکەڵ بوو. منی لەتۆ متوربە کرد. تۆ وەک کۆلکەی درەختەکەی و منیش وەک لقێکی ناسک هەموو بایەک دەمشەکێنێتەوە، بەلام تازە بۆ هەمیشە لەتۆ متوربە کراوم و لێت جیا بمەوە سیس دەبم، دەژاکێم و دەبمە وشکەڵەدارێکی بێگیان.

لەبەر تەزووی سەرماکە ئەمدەست ئەودەست بەکتێبەکان دەکەین و خێرا باوەشیان پێدا دەکەینەوە. بەسەر بەفری کۆلانەکاندا دەرۆین و نێو حەوشە نەوییەکان دیارن. ئەمڕۆ بە درەنگەوە دەچینە مەدرەسە. ئەمساڵ ئاغام وانە بە دووپۆل دەڵێتەوە. من و چەند کوڕی دیکە ساڵی رابردوو پۆلی یەکەممان خوێند. چەند کوڕی بچووکتر ئەمساڵ لە پۆلی یەکەمدا ناویان نووسیوە. تەمەنی مەدرەسە قوڕینەکە، ئەمساڵ دەبێتە دووساڵ. ئاغا لەپەنجەرەوە لە خوارووی ئاوایی دەڕوانێت. کەمێک لە لێژاییە سپیپۆشەکەی بەرمالان ورد بۆوە. لە نەکاو رووی وەرگێڕا و گوتی: منداڵینە ئاقڵ دانیشن، رەهنما هات. کتێبەکانمان لەسەر میزە دارینەکان پانکردەوە. ئاغا بۆ چەندەمین جار، بەخێرایی ناوی هەرسێک وێنەکەی سەر دیوارە قوڕینەکەی بۆ گوتینەوە. هەمیشە ئاغا لەوە



دەترسا کاتێک رەهنما ئەم ناوانەمان لێدەپرسێت، لەبیرمان کردبن، یان بە هەڵە بیانڵێینەوە. لەماوەی ئەم دووساڵەدا هەر ئەم میرزا مەحموودە بەناوی رەهنما دەهاتە قوتابخانەکەمان. جار نەبوو رەهنما ناوی خاوەنی ئەم وێنانەمان لێنەپرسێت. ئەمڕۆ ئاغا بە جلە سەربازییەکەوە نەهاتووە. ناوەکان کەمێک دوور و درێژن. هەموومان وەک تووتی لەبەرمان کردوون.

ئاغام لە تەورێز دەیگوت، ئێمە هەموومان وانەی مێژوو وەک تووتی لەبەر دەکەین. بەشی هەرەزۆریشمان بەرلە ئیمتیحان لەبیرمان دەچێتەوە. ئاغا زۆر باسی مێژوو و جوگرافیای دەکرد. یەک سەعات بە جوگرافیا و مێژووی گوندێکی ئازەربایجاندا دەچۆوە. دەتگوت دەترسێت مێژووی ئەم گوندانە بگۆڕن، یان دەیهەویست بە زەبری گێڕانەوەی بەردەوام مێژووی دڵخوازی خۆی دروست بکات.

دەرگا دوودەرییە دارینەکەی تاکە ژووری قوتابخانە دووجار تەقەی لێوە هات. ئاغا گوتی:

بفرمایید!

قەڵافەتێکی بەرز لەنێو پاڵتۆیەکی مل بە کوڵکدا لەم دیوەی دەرگا دوودەرییە نەوییەکەوە بەرز بۆوە و سەری کەمێک لەلای سەرووی چوارچێوەی دەرگاکە بەرەوبان تێپەڕی. قەڵافەتی ئەم میرزا مەحموودە بوو. ئەوکات هەروا داڵگۆشت بوو، بەلام گوڕ و تینێکی زیاتری پێوە دیار بوو. ئێستا ئەوەندە کەمهێزە، وێناچێت دانیشتبێ. هەر دەڵێی بە کورسییەکەوە هەڵیانپەساردووە، بەلام جەندەکی ئێسقانی و بەداروباری یارمەتیی رێکبوونی ماسوولکە و پێستەکەی داوە. ئاغام قەڵافەتێکی سەربازانەی بە خۆیەوە گرت و گوتی:

بەرپااااا!!

هەموومان جووتپێ، پێمان لە عەردە خۆڵینەکە کوتا و یەکپێ

هەستاینەوە. نێوگۆڕکی مەدرەسە تازە ئاوڕشێن کرابوو. بۆنی خۆڵی سەرەتای باران بارینی لێوە دەهات.

– بنشینید! سەرکار بلوت ئۆغلۆ، چرا یۆنیفۆرمیِ سپاهیان دانێش را نەپوشیدی؟[1]

ئاغاش هەر بەفارسی گوتی: قوربان، لەنێو ئەم بەفرە قورسەدا گوتم ڕەنگە ئەمڕۆ مەدارس هەموویان تەعتیل بن. بەڕاست پێم وانەبوو بەم ڕێگەبەندان و بەفر و سەرمایە جەنابتان تەشریف بهێنن.

– هەر بۆیە هاتم بزانم تەعتیلت کردووە یان نا. بەعزێک لە سپاهیانی دانش لەم فورسەتانەدا مەدرەسەکان تەعتیل دەکەن. بێزەحمەت دەفتەری بازرەسی بێنە.

قایشی تاپڕە دوو لوولەکەی لە شانی داماڵی. ئاغا لەدەستی وەرگرت و بە گۆشەی دیوارەکەوە هەڵیپەسارد. دەفتەرەکەی کردەوە و شتێکی لەسەر نووسی. بە تەنیشت دەفتەرەکەدا قامکێکی بەسەر مێزەکەی ئاغادا هێنا و تۆزەکەی لەنێو دوو ئەنگوستی دەستی ڕاستیدا گرمۆڵە کرد و فرێیدا. هەموومان سەرمان بەدوای تۆپەڵە تۆزە گرمۆڵە کراوەکەدا سووڕاند. من نەمزانی لە کوێ وەعەردی کەوت. ئەگەر لەترسی ئاغا وێرابام، لە منداڵەکانی دیکەم دەپرسی ئاخۆ ئەوانیش وەک من ونیان کرد؟ پێمخۆش بوو هەستمەوە سەرم بەرز کەمەوە و سەیری رووبەری سەر مێزەکە بکەم و بزانم جێ پەنجەی ئاغای رەهنما بە سەر مێزەکەی ئاغامەوە چۆن دیارە. ڕەنگە هێڵێکی پانی لە شێوەی کەوانە، تۆزەکەی لەسەر لادرابێ و لە کۆتاییدا ئەو کاتەی پەنجەی رەهنما ویستوویەتی رووبەری میزەکە جێ بهێڵێت کەمێک تۆزی زیاتر لەوێ کەوتبێ و کۆ بووبێتەوە. خۆزگە بەر لە هاتنی رەهنما بە پارچە پەڕۆکێک هەموو تۆزی سەر میزەکەم پاک کردباوە.

١- دانیشن، سەرکار بولوت‌ئۆغلوو بۆ جلکی سەربازیت نەکردووەتە بەر؟



لای خوارەوەی بەژنی قەڵەمەکەی لەناو پەنجەکانیدا ڕێکگوشی و بە سەر دەفتەرەکەدا نەوی. یەک دوو هێڵی لە سەر کاغەزەکە ڕەش کرد.

– بولەند شۆو! ئیسمەت چیە؟[1]

– رزا بولوت‌ئۆغلوو.

– ئاقای بولوت‌ئۆغلوو، ئین پسەر فەرزەندێ شوماست؟[2]

– بەلێ چاکرێ شوماست.[3]

لە لای ڕاستەوە، ناوی یەکە یەکەی سێ وێنەکەی سەر دیوارەکەم لێ دەپرسێت و بە ئیشارەی پەنجە لە وێنەی یەکەمەوە، دووهەم و سێهەم دەستنیشان دەکات:

–...

ئەعلا حەزرەت هۆمایوونی شاهەنشاهێ ئاریامێهر، محەممەد رەزا شاهێ پەهلەوی، شاهەنشاهێ ئیران.

–...

–... عولیا حەزرەت شەهبانوو، فەرەح پەهلەوی مەلەکەیێ ئیران.

–...

ئەعلا حەزرەت شاهزادێ رەزا پەهلەوی وەلیعەهدێ ئیران.

هەرسێک وێنەکە لە چوارچێوە گیراون و لە ریزێکدا بە بەرزترین شوێنی دیوارە نەویەکەی سەرووی تەختەڕەشەکەوە هەڵواسراون.

بە لەپی دەست بەسەر کورسییەکەی ئاغادا دێنێت و لەسەری دادەنیشێت. ئانیشکی دەخاتە سەر مێزەکە. بەدەم بزەیەکەوە چەند دێڕێکی دیکە لە دەفتەری بازڕەسییەکە دەنووسێت و ئیمزای دەکات.

* * *

١- هەستە سەرپێ، ناوت چییە؟
٢- بەرێز بولوت ئۆغلوو ئەم کورە منداڵی تۆیە؟
٣- بەڵێ، خزمەتکاری تۆیە.

نازانم چۆن گەیشتمە بەر دەرگای موسافیرخانەکە. دوای دیتنی میرزا مەحموود، هەرچەند گوشار بۆخۆم دێنم شتێکی کەمم دێتەوە یاد. پێش ئەوەی ئاغام ببێت بە سوپاهی دانیش، شتێکیم وەبیرنایەتەوە. نایەتەوە بیرم چۆن لەگەڵ ئاغام لە تەورێزەوە هاتبووینە ئەم گوندە. نازانم ئەوە خەیاڵە یان ڕاستی. هێندێک جار پێموایە بەر لە هاتنی ئاغام من هەر لەوێ بووم. نازانم، ڕەنگە خەونیش بیت. مام میرۆ منی زۆر خۆش دەویست. دەیگوت، ڕاستە تۆ کوڕی ئاغای سوپای، بەڵام منیش وەک ئاغای سوپا خۆشم دەوێی. لەگەڵ ئاغام لە یەکێک لە دوو ژوورە قوڕینەکانی ماڵی مام میرۆدا دەژیاین. مام میرۆ ئێواران بزنەکانی لە چیا دەهێنایەوە و بەیانیان بەرلە دەرکەوتنی خۆر، بەرەو چیا دەڕۆیشتەوە. ژنانی دراوسێ ماست و پەنیریان بۆمان دەهێنا. زۆربەی شەوان خەڵکی گوندەکە ئاغامیان دەعوەتی شیوخواردن دەکرد. ئەو کەمتر منی لەگەڵ خۆیدا دەبرد. ئەو کاتانە زیاتر لای مام میرۆ دەمامەوە. ئەگەر ئاغام زانیبای ئێوارەیەک مام میرۆ زۆر بەدرەنگەوە دێتەوە ماڵ، بەتەنیا جێی نەدەهێشتم و لەگەڵ خۆیدا دەیبردم. هێندێک شەوان مام میرۆ ئاوی گەرم دەکرد و لە تەویلەکە تاسێکی گەورەی لەژێر پێم دادەنا. بە مەسینە ئاوی شیرەوتینی پێدا دەکردم و دەیشووشتم. کەفی سابوونە بۆنخۆشەکە دەچووە چاومەوە و دەستم بەگریان دەکرد. مام میرۆ وایدەزانی ئاوەکە گەرمە و ئاوی ساردی دەکردە نێو مەسینەکە. ئەمجارەیان لەسەرمان هەڵدەلەرزیم. لەوە دەترسام بزنێک لە نزیکمەوە بپڕمێنێت و چڵم و لیکم پێدا بکات. لەو کاتانەدا ئەگەر ئاوی گەرم نەمابا، هەر ئاوە ساردەکەی پێمدا دەکرد. هێندێک جار پێش ئەوەی بمشوات، بە مەکینەیەکی دەستی یان بە مقەست قژەکانی بۆ دەتاشیم. زۆر لە مقەستە ژەنگ گرتووەکە دەترسام. مەکینەکە باشتر بوو، مام‌میرۆ بە کەمێک ڕۆن چەوری دەکرد و تاڵەموویەکانی سەرمی هەڵنەدەکەند. بەڵام مقەستە ژەنگاوییەکە



مووی سەرمی دەجاوی و بە ریشەوە هەڵیدەکەند. خۆم وێک دێنا و ئاو بەچاوانمدا دەهاتە خوار. لەگەڵ فرمێسکەکەم ئاوی لووتیشم بەند نەدەبوو. لە ترسی ئەوەی نەکا تاڵەموویەکی سەرم کەوتبێتە بەر لووتمەوە، نەمدەوێرا ئاوی لووتم هەڵلوشمەوە. بە هەڵلوشینی تاڵە موویەک تووشی پژمینیش دەبووم. لەو کاتەدا هەزار خۆزگە بە پژمینی بزنەکەی تەنیشت ئەو تاسەی منی لەسەر دەشۆرام.

* * *

رانە مەڕێک لە قووڵایی دۆڵەکەوە بەرەو بەرزایی هەڵگەڕا. قاچاخچییەکە گوتی:

– ئیرۆ ل تخوبێ چ ترس نینە، هاتنا شڤان و پەزێت وی، نیشانا نەبوونا ترسا عەجەم و ترکانە.

هەرچوار کەسیان دەمیان بەش کردەوە و هیچ لەم رستانەی قاچاخچییەکە تێنەگەیشتن. هەموویان روویان کردە من. منیش ئەگەر ئەم چەند ساڵەی دوایی، قوتابی بەردەستی ئەفسانە نەبوایەم، لەم زاراوەیە تێنەدەگەیشتم.

«کوردی نڤیسین ب تیپێن لاتینی» ئەم کتێبە چییە ئەفسانە؟ چۆن دەبێ زمانێک دوو ئەلف و بێی هەبێت؟ باش بوو زوو بیرم لێکردەوە و نەمدرکاند. لەدڵی خۆمدا وامگوت. ئەوە نییە لەتەورێزیش گۆڤارە تورکییەکان بە پیتی فارسی دەنووسران و ئاغاشم دەیگوت لە ئازەربایجان و تورکیا بە پیتی لاتین دەنووسرێن؟ ئاغام دەیگوت هەمووی یەک زمانە، لە ئازەربایجان پیتەکان رووسین، لێرە فارسین و لە تورکیاش جۆرێکی دیکەن. ئەوەتا ئەو کتێبەی ئەفسانە لێرە بە کەڵکم هات. نەمخوێندبایەوە، منیش وەک چوار هاوڕێکەی دیکەم دەمم بەش دەکردەوە. شاری گێلاساوا فێری زۆر شتی کردم. لەوێ خەڵکەکە بە دوو زاراوەی کوردی قسە دەکەن. بەشێکیان شێوازی قسەکردنیان زۆر

لە هی ئەم قاچاخچییە نزیکە. من زۆر قەرزداری شاری گێلاساوام. تا ئەفسانە، هەمووی هەر قەرزداری تۆم. تۆ نەبای، ئەوەندە لەم شارە بەند نەدەبووم. بە بۆنەی تۆوە لەم شارە ویڵم. بەڵام ئێستا ناچارم بەجێت دێڵم.

شوانە، مێگەلە مەڕەکەی بەرەو بەرزایی دەهات و خۆی لەداوێنی خـوارەوە چاوەدێریان بـوو. ڕەنگە شوانەکان بەهۆی نزیکبوون لە سنوورەکە، کەمتر خۆیان لەم کێوە دابێت. دیارە ئەوانیش ڕۆژانی پێنجشەممە بە دەرفەت دەزانن. پێنجشەممۆیان قاچاخچییەکان بێ‌ترسترن. بە قسەکانی قاچاخچییەکەوە دیاربوو شوانەکان پێنجشەممۆیان ئازادترن.

ڕۆژی پێجشەممۆ بوو. لە پارکەکە یەکەم وانەی کوردیم لای ئەفسانە دەست پێکرد. لەم کوێستانە بژوێنە، لەوەڕ بە دڵی ڕانەمەڕەکەیە. مەڕەکان لە چیاکە نیشتوون و گوڵوک و سەرچڵی شینکە هەڵدەپسێنن. شوانە لێمان نزیک دەبێتەوە. هەردووک دەستی داوێتە سەریەک و دایاندەنێتە سـەر قەفی گۆچانە چەقیوەکەی و چەنەی داوێتە سـەر. چاوەکانی چاوی مام میرۆن. لەگەڵ دەنگی هەڵپساندنی شینکە و پرمەی نێری و بەرانەکان، بە نەرمەبزەوە لێیان دەڕوانێت. بە نزمی چەند ڕستەیەک لەگەڵ قاچاخچییەکە دەگۆڕێتەوە. هەردووکیان بزەیان دێتێ. دیارە شوانە یەکەم جاری نییە کاروانی قاچاخی مرۆڤ لەم سنوورە دەبینێت. لەژێرەوە بە تەهمینەدا هەڵدەڕوانێت. بە نەرمە بزەوە رووی وەردەسووڕێنێت. گنجی لاڕوومەتی لەژێر ریشە کورتە ماشوبرنجییەکەیەوە وەک گنجی لاڕوومەتی مام‌میرۆ دەچێت.

مام میرۆ هەموو ئێواران کە دەگەڕایەوە ماڵ، دوای ئـەوەی بزنە بزۆزەکانی لە نێو پەرژین دەکرد، بە کەلێنی پەرژینە تەنراوەکەدا لێیانی دەڕوانی. پاشان بەو رۆن زەیتوونەی ئاغام لەشارەوە بۆی دەهێنا پشتی دەستە قەڵشیوەکانی چەور دەکرد. مام میرۆ و ئاغام بە زمانێک دەدوان



من هیچ لێیان تێنەدەگەیشتم. دواتر ئاغام دەیگوت مام میرۆ تورکییەکی پەتی دەزانی و من هەوڵم دەدا ئازەرییەکەم بەلای تورکییەکەی ئەودا بشکێنمەوە.

تووڕەج! بۆچی بەم شێوەیە سەیری تەهمینە دەکەی؟ دەترسی وەک منت بەسەربێت؟ لە دابڕان دەترسێی؟ لە ڕوانینی تەهمینەوە ترسی ئەم دابڕانە بەدی ناکەم. ئەو ڕۆژەی ئەفسانە بە تێرادیوی پرێسکەی دڵی بۆم کردەوە و شریتی ژیانی بۆ لێدامەوە، هەستم کرد بە چەشنێک تێکەڵ بووینە تەنیا مەرگ دەتوانێت دامانبڕێنێتەوە. تووڕەج ئەگەر تەهمینەش وەک ئەفسانە دەروونـی خۆی پێشانی تۆ دابێت، ئیدی ئەم ترسەی پێناوێت.

ئەفسانە خانم، ئیحتماله هاتنی من بۆ ماڵی ئێوە تووشی نارەحەتیت بیکات. ڕەنگە هاتنی من بۆ ناو زیندەگی تۆ و دایە مەرجان، بیتانخاتە مەوقەعیەتێکی ناخۆشەوە.

– من ئەفسانە خانم نیم. لەمەودوا ئەفسانەی رووتم. پێم بڵێ ئەفسانە، تەواوە.

ئەفسانەی رووت! تاکە جلێکت لەبەردا نەما. رووتی رووت. کاتێ لە تەنیشتەوە لێت دەڕوانم بە ڕووتی زۆر جوانی. پێمخۆشە کاتێک رووت دەبیەوە هەر لە تەنیشتەوە بتبینم. لەم کاتەدا هەوەسی نێرانەم ناتوانێت بەسەر هەستی جوانیخوازمدا زاڵ بێت. سەرتابەخواری لەشی رووتت جوانیی لێدەبارێت و من لەجیاتی ئەوەی هەست بە مەیلی برسی و مێخوازانەی پیاوانەم بکەم، هەست بە ئاشکرابوونی جوانییەکی بێ‌هاوتا دەکەم. هەست دەکەم لە پەیکەرێک دەڕوانم وەستایانە داڕێژراوە، کاتێک تەنیا رووت بەرەو من وەردەسووڕێنی سەرم لە قەڵەمکاریی وردی پەیکەرسازەکە سوور دەمێنێت. بۆیە هەر لە تەنیشتەوە سەیرت دەکەم. من لەو ساتەوە ناتوانم بە جلەکانتەوە بتهێنمە بەرچاو. لەبەرانبەر دایە

مەرجان و لە ژووری چێشتلێنان و تەنانەت لەسەر شەقامیش بەرووتی دەگەڕێی. لە ئیدارەی کەشاوەرزیشدا بەرانبەر بە هاوکارەکەت بە ڕووتی شیعرەکانی خەییام دەخوێنیەوە:

خۆزگەم بەکەسێ نیشان و ناوێکی نەبوو
لە شوێن پڕوپووچ خەیاڵی خاوێکی نەبوو
نەک وەک من و تۆ کوندە بەبۆ ئاسایی
چاوی لە قەڵایەک بوو، کەلاوێکی نەبوو

ڕەنگە توورەجیش هەمیشە تەهمینە بەرووتی ببینێت. بڵێی تەهمینەش بەودەنگە خۆشەی شێعرەکانی خەیام بە فارسی بۆ توورەج نەخوێنێتەوە؟ من هەرگیز بیرم لەوە نەکردۆتەوە ئاخۆ خەڵکی دیکەش بە ڕووتیت دەبینن؟ پێتوایە ئەگەر قاچاخچییەکە و من و دوو کوڕە ئەفغانییەکە تەهمینە بەڕووتی ببینین، شتێکی نەخوازراو بقەومێت؟ لەمن مەترسە توورەج. من تەنیا دەتوانم ئەفسانە بە رووتی ببینم. ئەوساتەی نیگام لەسەر لەشی تەهمینە دەگیرسێتەوە، بەرلەوەی رووتی کەمەوە، دەبێتە ئەفسانە. نابێ گلەیی لەمن بکەی توورەج! تەهمینە تا بەتەواوی نەبێتە ئەفسانە بە رووتی نایبینم و لەکاتێکدا خەریکە دەبێتەوە تەهمینە، وردە وردە تارماییەک بەسەر لەشیدا دێت. پێشان جلەکانی دەردەکەون و دواتر ڕوخساری دەبێت بە مانگ و ئەو لەچکەی لە ڕەنگی لەچکی دایە مەرجانە دەبێتەوە خەرمانی دەوری مانگ.

– رەزا گیان، ڕەنگە هاتنی تۆ بۆ نێو ژیانی من و دایە مەرجان ئاخری خێر بێت. هیچ لەوە مەترسە.

– لەو وەقتەوە چاوم بە زندەگی تۆ و دایە مەرجان کەوتووە، مەجموعەیەک سوئال لە مەغزمدا دین و دەچن. ئیحتماله مەترەح کردنیان بۆ تۆ خۆش نەبێت.

– پێم خۆشە ژیانم بۆ کەسێک بگێڕمەوە، متمانەم پێی هەبێت.



دەمهەوێ ئەوەی لەدڵمدایە، هەڵیڕێژم. پێموایە گێڕانەوەی رابردووم بۆ هاودەمێکی گوێگر، باری خەمەکانم سووکتر دەکات. هەرچی پرسیاری لە دڵتدایە بیکە. منیش تینووی هەڵڕشتنی وەڵامی پرسیارەکانم.

– من راجع بە گوزەشتەی خۆم سوئالم زۆرە. سوئالی گەورە لە زندەگیمدا بێجەواب ماونەتەوە. نازانم چۆن بە جەوابەکەیان دەگەم. ئاشنایی لەگەڵ تۆ زۆر خۆشحاڵی کردم، ئەمما...

– ئەمما چی؟ پێم خۆشە ئەم ئەممایانە نەمێنن. بێپەردە و لەمپەر بەیەکەوە قسە بکەین.

– ئێوە خانەوادەی شەهیدن و پێم خۆش نییە پرسیاری وا بکەم، باوکی خۆشەویستت وەبیر بێنمەوە.

– من هیچ کاتێک باوکمم لە یاد ناچێتەوە. باوکم هانیداوم فێری زمانی خۆم بم. لێرە لە سەرانسەری ئەم کوردستانە کەم نین ئەوانەی هەوڵ دەدەن فێری زمانی خۆیان بن. کاک رەزای بەڕێز، ئێستا منیش نازانم تۆ خەڵکی کوێی و سەر بە کام نەتەوەی. دایە مەرجان پێتی گوت ژیانی ئێمەش ئاڵۆز و سەیر و سەمەرەیە. بەڵام من وەک تۆ نیم. هەر نەبێ باوکی خۆم دەناسم و دەزانم کچی کێم.

ئەم قسەیەت کاری لە جەرگم کرد. هەستم کرد بێبەزەییانە سەیرم دەکەی و وادەزانی من کەسێکی بێدایک و باوکم و تۆ بەخۆت دەنازی، کچی پیاوێکی ناسراوی کە لە ڕێگەی خاک و نیشتمانەکەیدا سەری داناوە.

– ڕاستە، تۆ کچی پیاوێکی کە دەر راهی حیفزی سنوورەکانی مەملەکەتی خۆمان شەهید بووە. ئەمما مەن لە سەرنەویشتی دەرهەم بەرهەمی خۆم گیج بوومە.

– رەزاگیان، باوکی من لە ڕێگەی پاراستنی سنوورەکانی ئەم مەملەکەتەدا نەکوژراوە، بەڵکو لە ڕێگەی نەهێشتنی ئەم سنوورە

دەستکردانەدا گیانی بەخت کردووە.

– باشە، ئەوەتا باوکی شەهیدت بە هەدەفەکەی گەیشتووە. کوردستان بە کاملی لە دەستی زیدی ئنگلاب دەرهاتووە و ئەلئان بە تەواوی ئازادە.

– دیارە تۆ ئاگاداری ئەوە نی ئێرە کوردستانە. لێرە زمانی کوردی لەهیچ مەدرەسەیەک ناخوێندرێت. من لە مەدرەسەی ئێرە فێری زمانی خۆم نەبووم. یەکەم ڕۆژ کە گوتت خەبیام بە کوردی نییە، تێگەیشتم هیچ ئاگاداری ئەم بارودۆخە نی. پێم خۆشە لەمبارەیەوە زیاتر قسە بکەین. پێچەوانەی تێگەیشتنی تۆ، کوردستان ئێستا ئازاد نییە.

هەستم کرد بەسەر ژیانێکی تازەدا کەوتووم. لەلایەک پێم خۆش نەبوو سەرئێشەی ئەم دنیا نەناسراوە بخەمە سەر ئەم هەموو کێشانەی خۆم و لە لایەکیشەوە ئەفسانە بەدوای خۆیدا رایدەکێشام و تینووی تێگەیشتنی زیاتری دەکردم. دوای شەڕی نێوان ئاغام و مامان دەمزانی منداڵی ئەوان نیم. بەڵام نەشمدەزانی کوڕی کێم. وردە وردە تێگەیشتم بەڕاستی من بیژووم و ئەم ناوەیان بە ناحەق لە من نەناوە. لەلایەک زمانی پاراو و شیرینی ئەفسانە و ئەم هەموو جوانییەی کاری کردبووە من و لێنەدەگەڕا وازت لێبێنم و لە لایەکی دیکەوە وەدوای میراتێک کەوتبووم کە بۆ خۆشم پێموابوو هەر فڕی منی بەسەرەوە نییە. خەریک بووم خۆم بەسەر مام میرۆدا ساغ بکەمەوە و بیکەم بە باوکی ڕاستەقینەی خۆم.

تۆ هاوڕێیەکی باش بووی. لە ڕێگەی ئەم زانیاریانەی تۆوە زمانی کوردی بەباشی فێربووم و باشتر کەلتوور و دابونەریتی ئەم ناوچەیەم ناسی کە شوێنی ئەم چەندساڵەی سەرەتای ژیانم بوو.

پێم خۆش نەبوو ئەمە ئاشکرا بکەم، بەڵام ناچارم دەبێ هەر بیگێڕمەوە. دوای ئەوەی مامان و ئاغام لەسەر من لێیان بوو بە شەڕ و مامان گوتی ڕاستەوخۆ بە رەزا دەڵێم کوڕی ئێمە نییە. بەردەوام هەوڵم دەدا کەڵک



لەم کێشەیەی نێوان مامان و ئاغام وەربگرم و سەرەداوێک لە ژیانی رابـردووم بدۆزمەوە. چەند ڕۆژ دوای شەڕی مامان و ئاغا، کاتێک دەرگای دەروازەم کردەوە، بە تەنیشت باخچە بچووکەکەدا لە پەنجەرەی ڕوو بە حەوشەی ئاشپەزخانە نزیک بوومەوە. ئاوی سۆندەکە خەریک بوو دێراوی باخچە بچووکەکەی بن دیواری حەوشەی پڕ دەکرد. بۆ گرتنەوەی ئاوەکە لە پەنجەرەی ئاشپەزخانە نزیک بوومەوە. خەریکی گرتنەوەی ئاوەکە بووم، بەسەر شەڕێکی دیکەی مامان و ئاغادا کەوتم. مامان بەسەر ئاغامدا دەیگوڕاند. دەنگی دەگەیشتە نزیک دەروازەی حەوشەکەش. ئاغا لەبەری دەپاڕایەوە ئەگەر سەبری لێبگرێت، عیلاجێک لە رەزا دەکات و هەوڵ دەدات هەر چۆنێک بێت تێمبگەیەنێت لەم ماڵە بڕۆم و دوای ژیانی خۆم بکەوم. کەڵکم لەم دەرفەتە وەرگرت. یەکسەر خۆم بە ژووری ئاشپەزخانە داکرد. ئاغا لە دواوەی مامانەوە لە سەر کورسییەک دانیشتبوو، چاوی بەمن کەوت. مامان پشتی لە ئاغابوو. بەدەم چێشت لێنانەوە دەیگوت، من سەبرم نەماوە و چیدیکە ناتوانم پیاوێکی زڕت و زەلام لەم ماڵەدا وەک کوڕی خۆم رابگرم. ئەمجارە تۆ دەشتهەویست ئەفسانەی بایرام کۆنە ساواکی[1] بهێنیە نێو ژیانمەوە و بە دوو بێگانە لەم ماڵە وەدەرم بنێنن؟ ئەرێوەڵا دەبێ هەموو شتێکی پێ بڵێی. مامان ئاوڕێکی لە ئاغام دایەوە و بە ڕوخسارییەوە دیار نەبوو بە دیتنی من تێکچووە. هەر دەتگوت لەسەرەتای کێشەکەیانەوە من لەوێم. یەکڕاست ڕووی کردە خۆم:

– رەزا گیان، چەند ساڵە ئەم سەفەرعەلییە درۆی لەگەڵ تۆ کردووە. تۆ کوڕی ئێمە نی. درۆی گەورەی لەگەڵ منیشدا کردووە. ئەو کاتەی سەفەرعەلی وەک سوپاهی‌دانیش چووەتە ئەو گوندە، پیاوێک بە ناوی مامیرۆ خانوویەکی داوەتێ بۆ ئەوەی ئەو ماوەیە لەوێدا بژێت.

١– ساواک: ڕێکخراوی سیخوڕیی ئێران لە سەردەمی پاشایەتیی پەهلەوییەکاندا.

سەفەرعەلی تۆی لەماڵی مام میرۆ دیتووە و گوتوویەتی ئەم کوڕەش دەبێ لەبەر خوێندن بنێی. مامیرۆ گوتوویەتی، ئەمە کوڕی من نییە. چەند ساڵێک لەمەوبەر کە مێگەلە مەڕم بۆ لەوەڕ دەبرد، لە بەر ماڵەکانی ئەم گوندە بە مەلۆتکەیی دیتوومەتەوە. نازانم منداڵی کێیە. هێناومەتەوە ماڵەوە و ژنانی ئاوایی شیریان پێداوە و گەورە بووە. ئێستاش وەک کوڕی خۆم سەیری دەکەم. کاتێک سەفەرعەلی بۆ جاری یەکەم لەو گوندەڕا هاتەوە تەورێز، ئەم داستانەی بۆ من گێڕایەوە. گوتی، ئەگەر رازی بی، دەیکەین بە کوڕی خۆمان. من و سەفەرعەلی منداڵمان نەدەبوو. دەیانگوت، من منداڵم نابێت و سەفەرعەلیش گوتی، لەبەر ئەوەی تۆم زۆر خۆش دەوێت، چونکە منداڵت نابێت، پێم باش نییە لە یەکتری جیا بینەوە. ئەم کوڕە لەوێ لەبەر خوێندن دەنێم و پاشان لەگەڵ خۆمدا دەیهێنمەوە. شوناسنامەشی نییە. لێرە بە ناوی خۆم شوناسنامەی بۆ وەردەگرم و دەیکەین بە کوڕی خۆمان. لەسەر قسەی هەردووکمان بەرلەوەی بگەڕێتەوە لات، لەکاتێکدا تۆ تەمەنت پێنج ساڵ بوو. بە ساڵێک زیاتر، لێرە شوناسنامەی بۆ وەرگرتی و بووی بە کوڕی ئێمە. تۆ لەپێنج ساڵیدا ساڵی یەکەمی مەدرەسەت خوێندووە. لەم ساڵانەی دواییدا بۆم دەرکەوت ئەوە ئەم پیاوە ناڕاستەیە منداڵی نابێت، نەک من. دکتۆران پێیان گوتم، تۆ کێشەی منداڵ بوونت نییە. ڕەزا گیان، تۆ دەتوانی بە دوای ژیانی خۆتدا بڕۆی و منیش هەر بەدوای ژیانی خۆمدا دەڕۆم.

ڕووی کردە ئاغام و دەنگە نزمەکەی بەرز کردەوە. خێراتر بەسەریدا گوڕاندی: تۆش ژیانی منت خرا کرد. ئەگەر هەر لە سەرەتاوە زانیبام خەتا لەتۆیە منداڵمان نابێت، بەزەییم پێتدا دەهاتەوە و بەجێم نەدەهێشتی. بەڵام ئێستا کە بۆم دەرکەوتووە لە ماوەی ئەم هەموو ساڵە درۆت لەگەڵ مندا کردووە، ناچارم ڕێگەیەکی دیکە بگرمە بەر. هەرچەند گەیشتوومەتە تەمەنێک ڕەنگە تازە منداڵم نەبێت، بەڵام مەش سەفەرعەلیی بەڕێز!



ئەوەندە لێک و لووس و لەبارم سەت پیاوی لە تۆ ڕاستگۆتر ملی خۆیانم بۆ بشکێنن. ڕەزا گیان، من ئەوەندە دڵڕەق نیم، بەڵام کاتێک هاوسەری ژیانم بە درێژایی تەمەنم درۆی لەگەڵدا کردووم، ناچارم واز لەم هەموو خۆشەویستییە دەرحەق بە تۆش بهێنم. تۆش لێم بەدڵ مەگرە. هەر پێم وایە کوڕی خۆمی. ئەوە شتێکە درەنگ یان زوو هەر ئاشکرا دەبوو. لەمێژبوو هەوڵم دەدا بە شێنەیی لەگەڵتدا دابنیشم و تێتبگەیەنم. بەڵام ئەم کابرایە نەیدەهێشت. زۆرم پێ ناخۆشبوو، دوای ئەم هەموو موحیببەت و خۆشەویستییەم بەمجۆرە بەسەر شەڕی ئێمەدا کەوتی. من تاوانم نییە. ئەم شەڕەی ئەمڕۆشمان نەبوایە، بیرم لەوە دەکردەوە هەر کاتێک بێیەوە، لە سەرەتاوە بۆت بگێڕمەوە. زیاتریش بۆیە باسم نەدەکرد، لەوە دەترسام ئەوەی ئەم کابرایە لەبارەی تۆوە بۆمنی گێڕاوەتەوە، ئەویش ڕاست نەبێت. کێ دەزانێ بۆ سوکنایی دڵی من، تۆی لە ماڵێکی هەژار نەکڕیبێ. ئێستاش پێم وایە سەفەرعەلی ئەم چیرۆکەی تۆی لە خۆیەوە دروست کردووە، یان هەر نەبێت بۆخۆی هێندێکی پێوەناوە.

چۆن وا دەبێ مامان؟ بۆ وات کرد؟ بۆ ژیانی خۆت و من و ئاغامت شێواند؟ ئەگەر رکیشت لە ئەفسانە بێت، نەدەبوو ژیانی من ئەوەندەی دیکە ئاڵۆز بکەی. من بۆم ناکرێت بە خۆم بسەلمێنم تۆ دایکی من نی. بۆ بێدایکت کردم. بەدرێژایی ئەم ساڵانە دایکی خۆم بووی. زەحمەتە دەستم لە دامێنت بەربێت. ئەو ساتانەم لەبیر ناچێتەوە کاتێک لە مەدرەسە دەگەڕامەوە، باوەشت پێدا دەکردم و بەرەو مێزی نانخواردنت دەبردم. ئەگەر دایکی من نەبای، چۆن هەموو بەیانیان لە خەوی شیرین هەڵدەستای و کتێبەکانی ئەو ڕۆژەی مەدرەسەت بۆ جیا دەکردمەوە؟ چۆن هەتا دەستم بەخۆم ڕاگەیشت، لە حەمام وەبەر لفکە و سابوونت دەدام و وەک گوڵی تازە پشکووتوو دەتناردمە نێو هاوپۆلەکانم؟ چۆن جلی جوانت دەکردە بەرم و کڕاوات و پاپیۆنت بۆ دەبەستم و لە مەجلیسی شایی و

میوانداریییەکاندا لەهەموو منداڵانی هاوتەمەنم جوانتر دەهاتمە بەرچاو؟

– کوڕی خۆم ئەگەر بە مەعدەی بەتاڵەوە بچییە مەدرەسە، برسیت دەبێت. دڵت تێکدەهاڵێت و وانەکان فێر نابی.

هەتا بەردەرگا بەدوامدا دەهاتی. ئاوڕم دەدایـەوە، تا دەروازەکـەم بەدوای خۆمدا دادەخست، دایکانە لەدواوە سەیرت دەکردم.

ئاغام لەوکاتەدا وەک دارێکی وشک لەسەر کورسییەکەی ئاشپەزخانە قیت دانیشتبوو. مامان قسەکانی تەواو کرد و رووی کردەوە چێشت لێنانەکەی. ئاغام لەسەر کورسییەکە هەستایەوە و دەستی نایە سەر شانم. بە گریانەوە گوتی: باشتر وایە بچییەوە کوردستان. هەوڵ بدە رێگەیەک بدۆزییەوە، مام میرۆ بکەی بە باوکی خۆت و داوای میراتەکەی بکەی. پارچە زەوییەکی باشی هەبوو. لە جێگەی پێویست من ئامادەم شاهیدیت بۆ بدەم کە تۆ کوڕی مام میرۆی. شاهیدیدانی من کاری دادگا و بەدواداچوونت بۆ ئاسان دەکات. من دەتوانم کارێکی وابکەم هەموو کەس بڕوا بەوە بکات تۆ کوڕی مام میرۆی.

من کە هەمووماوەی ژیانم لە تەورێز گەورە ببووم و خوێندبووم، هەستم کرد بەسەر کەشێکی زۆر نامۆدا کـەوتـووم. من ئەفسانەی کۆرئۆغڵوم خوێندبۆوە. حەیدەر بابای شەهریارم هەموو لەبەر بوو. شانازیم بە شێخ محەممەدی خیابانی دەکرد. لە کۆڕ و کۆبوونەوەکانی ئاغام لەگەڵ مامۆستاکانی دیکەی قوتابخانەکانی تەورێز و دانیشتنەکانی شەوانەیدا لەگەڵ حکومەتەکەی ئازەربایجان و جەعفەر پیشەوەری ئاشنا ببووم. لە قاوەخانە سوننەتییەکان گوێم بۆ بەیاتییەکانی عاشیقە دەنگ خۆشەکان شل کردبوو. لە مەدرەسە هەندێک لە مامۆستاکانم «ننه منجوق» و «ماهی سیاه کوچولو» و«٢٤ ساعت در خواب و بیداری»ی سەمەد بێهرەنگیان پێدابووم. کتێبی «کندوکاو در مسائل تربیتی ایران»یشم خوێندبۆوە. چیرۆکی «پسرک لبوفروش»م لەبیر



ناچێتەوە. لەگەڵ هاوڕێکانم لە کێوی سەهەند سەرکەوتبووین و پێکەوە سـروودی«ئـاراس ئـاراس قان ئـاراس»مـان[1] بەیادی خنکانی سەمەد بێهرەنگی لە ئاوی رووباری ئاراسدا، بە دەنگی بەرز خوێندبوو. دووجار لەگەڵ کاروانی بەسیجییەکانی مەدرەسە لە جبهەی شـەڕی دیفاعی موقەدەسدا دوور و نزیکی سەنگەرەکانی سەربازانی عێراقی بوومە. پێش ئەوەی شەڕی چەکداری لە کوردستان رۆمرکێت، چەندجار هەوڵمداوە لەگەڵ بەسیجییەکانی مەدرەسە بڕۆمە کوردستان و ئاغام لەم کارە پاشگەزی کردوومەتەوە.

– ئەم پاتەکەی[2] دوژمن دەفع بکرێت، رەزمەندەگانی ئێمە لە هێرشێکی دیکەدا بەسرە دەگرن و لەماوەی رۆژێکدا دەگەینە کەربەلا.

– هات، هات! خۆتان لە عەردی دەن. هاشوهووشی ئەم خومپارانە؟[3] هەر دەڵێی هەموویان لەسەر سەری ئێمە دەکەونەوە زەوی!

– باشە ئێمە بۆ ئەوەندە شێتین؟ بۆ لە دەرەوە دانیشتووین؟ کێ دەڵێ خومپارەیەک لەنێومان ناکەوێت؟ هەستن با بچینەوە نێو سەنگەرەکە.

– هـەر لەخۆڕا دەچینە دەرەوە. ئێرە سـەری بە ئاسن و سیمان داپۆشراوە، بە تۆپیش لێیبدەن ساچمەیەکمان وێ ناکەوێت.

– سەیری کە، چەندە لە دەرەوەش فێنکترە!؟

– ئەم بارستا خۆڵەی کردوویانەتە سەر ئەم سەنگەرە گوللە تۆپی وێبکەوێت، هیچی لێنایەت. ئەوەنییە چەندەش فێنک و خۆشە؟ ئەم چەند رۆژە لێرەین با خۆمان بە کوشت نەدەین.

– ئەوە چ دەکەی رەزا، راوەستە با ئەم تۆپبارانە تەواو بێت.

– چبکەم، لەتینوێتی خنکام!

---

١– «ئاراس ئاراس خوێن ئاراس»سروودێک بوو بە زمانی تورکی ئازەری بە بۆنەی خنکاندنی سەمەد بێهرەنگی لە چۆمی ئاراسدا دەگوترا.

٢–پاتەک: لە مەیدانی جەنگدا بەو هێرشە دەکوترێت کە دوای هێرشی دوژمن ئەنجام دەدرێت. دژە هێرش

٣–خومپارە: گوللـە هاوەن

– دەی لە کۆلمەنەکە ئاو بخۆوە.

– ئاوی تێدا نەماوە.

– ئەی بەتەمای بچی لە تانکێرەکە لەبەر ئەم سوورەتاوە ئاوبێنی؟ ئەوەندە سەهۆڵەش دەتوێنیتەوە.

– چەندە گەرمە؟ تۆپ و خومپارە هیچ، چەند رۆژی دیکە لێرەبین لەبەر پیسی هەموو نێوگەڵمان گڕوێ دەبێت و ئەم گەرمای جنووبە دەمانسووتێنێت.

– خەمتان نەبێت، ئەم هەفتەیە تەواو بێت، لە گەڕانەوەدا لە چێشتخانە سەڵەواتییەکانی[1] سەر ڕێگا تێر دەخۆین، سڵەوات لێدەدەین و بە چەپڵەڕێزان دەڕۆینەوە تەورێز.

– ئەگەر نەکوژرێین، لەکۆڵانی خۆمان پۆز لەسەر کچان لێدەدەین و دەڵێین، رەزمەندەین[2] و تازە لە جەبهەی شەڕ گەڕاوینەتەوە.

– ئێوە زۆر کەرن، ئەوی بیری لێ نەکەنەوە جبهەیە. خۆ ئێمە بۆ ئەوە نەهاتووینە هیچ نەکەین.

– بۆ قوربان ئەوە لە چڵک و گەرمادا گڕوێ دەبین، دەتهەوێ چی بکەین؟

– شەڕ! دەبێ شەڕ بکەین. شەهید بین باشترە نەک بچینەوە لە کۆڵانەکانی تەورێز خۆمان پێشانی خەڵک بدەین و پۆزیان لەسەر لێدەین.

ئەم هەتیوە کاتێک دەستی بەقسە دەکرد، دەتگوت مەلای دوازدە عیلمە. هێندێک جار لەگەڵ قسەکانی ئەو دەنگی سروودەکانی سادقی ئاهەنگەران لە بڵێندگۆی سەنگەری تەبلیغاتی ئیسلامییەوە بڵاو دەبۆوە. من لەو کاتەدا موچوڕکم پێدا دەهات و تووکی سەرم قرژ دەبوو.

---

[1] – چێشتخانەی سەڵەواتی: ئەو چێشتخانانە بوون لە کاتی شەڕی هەشت ساڵەی نێوان ئێران وئێراقدا ئێرانییەکان لە پشت بەرەکانی شەڕ بۆ سەربازانیان دانابوو و خواردەمەنی بەلاشیان لێ ئامادە دەکرا.

[2] –رەزمەندە: خەباتگێر



هەستم دەکرد ئێمە خۆمان دەگێزرێنین. بێئەوەی گوێ بدەینە قسەی فەرماندەکانی ئەرتەش و سوپا، دەبێ هەتا سەنگەری یەکەمی دوژمن بە پێوە ڕاکەین. کاتێک دین و نامووس و نیشتمان لە مەترسی دایە، چۆن بیر لەوە بکەینەوە لە نێو کیژان و کوڕانی تەورێزدا نازی دیتنی خەتی موقەددەمی جەبهەیان بەسەردا بکەین؟

ئەو کاتەی لە گەڕانەوە بەرەو تەورێزدا داوامان لە شۆفیر پاسەکە کرد دەنگی سادقی ئاهەنگەران[1] کەم کاتەوە و خۆمان دەستمان بە گۆرانی گوتن کرد، لەنێو کۆمەڵێک پرسیاری بێوەڵامدا دەخولامەوە. بیرم لەشەڕ دەکردەوە. دەمگوت ئەگەر لەم سەفەرەدا سەرم نەهێنابایەوە، مامان و ئاغام بە وەجاخکوێری دەمانەوە و بە تەواوی لە خەمی مندا تێدا دەچوون.

سەرەڕای هەموو ئەو بیرەوەرییە خۆشانەی تەورێز، ئەم قسانەی مامان و بەڵێنیی مەش سەفەرعەلی بلوتئۆغلو بۆ شاهیدیدان، هانیان دام بێمەوە گیلاساوا. بەڵام تۆ بە یەکجاری لێرە بارگە و بنەت پێ بەعەردی دادام.

* * *

بە کۆمەڵێک دەستکەوتی تازەوە گەڕامەوە تەورێز. رەحم و بەزەیی دایە مەرجان و هیوای داهاتووم بە ئەفسانە و هاندانەکەی ئاغام، هیوای ژیانیان بەهێزتر دەکرد. دوودڵ بووم لەوەی بچمەوە کۆڵانەکەی خۆمان و بە بەر دووکانەکەی مەش بایرامدا بڕۆم. دەترسام تووشی ئەفسانە بم. ئەوکات ئەم ئەفسانەیە و ئەو ئەفسانە، دەیانخستمە دووڕێیانەوە. ئەدی ئەگەر مەش بایرام بانگم بکات؟ هەنگاوەکانم پێچەوانەی بیرکردنەوەم، بردیانمەوە بەر دووکانەکە. دەڕابەکە هەڵدرابۆوە و

---

[1] – سادق ئاهەنگەران، گۆرانیبێژێکی دەنگخۆش بوو بۆ هاندانی سەربازانی بەرەکانی شەڕی ئێران و عێراق دەنگی لە رادیۆ و بڵندگۆکانی مەیدانی شەڕەوە بڵاو دەکرایەوە.

شووشەکان داخرابوون. بێئیختیار دەستەکانم بەئەملاو ئەولای تەوێڵمەوە گرت و چاوم بە جامی دووکانەکەوەنا. سەری لووتم بە جامەکەوە فێنکایی هەمیشەی ئێوارانی تەورێزی هێنامەوە یاد. لەودیو جامەکە، لەسووچی دەرگا بچووکەکەم روانی. نیوەی کرابۆوە. بە خەیاڵمدا هات لەژوورەوەی دووکانەکەم و لەجیات مەش بایرام، ئەفسانە دووکانداری دەکات. لەمبەر ئەوبەری مێزەکەوە بە بیانووی وەرگرتنی پارە، دەستم دەگوشێت. لەخۆشیان مچورکێک لە بەری پێمەوە هات و لە تەوقی سەرم دەرکەوت. دووکانەکە چۆڵە. نە مەش بایرام و نە من و نە ئەفسانە هیچمان لەوێ نین. ترسم رێنیشت مەش بایرام یان عەممە جەیران لەو دیو دەرگاکەوە بمبینن. سەرم کێشاوە دواوە. هەستم کرد بەژنم لە نێو شووشەی دوکانەکەدا کەمێ بەرەو پێشەوە نەویوە و شلەژانێک بە ڕوخسارمەوە دیارە. من و دەروازە سەوزەکەی پشتەوەم و پەردەی نێو پەنجەرەکانی سەرەوەی دەروازەکە نەخشی سەرجامی دووکانەکە بووین. ترسم رێنیشت دراوسێکەی بەرانبەریان هەر ئێستا سەیری من بکات. کەمێک لە پێش جامی دووکانەکە جووڵام، کاغەزێک بە شووشەکەوە نیوەی سەرمی لە بەژنم جیاکردەوە. لە لووتمەوە بەرەوسەر کەوتە سەر کاغەزەکە. لێی ورد بوومەوە. کاغەزێکی سپی کە بە هێڵێکی پانی ڕەش چەند دێڕێکی خستبووە گەمارۆوە، لە دیوی ژوورەوەی دووکانەکە بە شووشەکەوە لکێنرابوو. لە دێڕی دووهەمدا چاوم بە ناوی سەفەرعەلی بولوت ئۆغڵوو کەوت کە بە ڕێنووسێکی جیاواز بە نێوچاوانی کاغەزەکەوە نووسابوو. دڵم داخورپا.

هوالحق

بازگشت همە بە سوی اوست

با کمال تأثر و تأسف درگذشت مرحوم مشهدی صفرعلی بولوت اوغلو را بە علت حادثەی رانندگی بە اطلاع می‌رساند. مجلس ترحیم



مرحوم از تاریخ....

پێشچاوم بۆماوەیەک تاریک داهات. ناتوانم درێژەی راگەیەنراوەکە بخوێنمەوە. نەمزانی چۆن گەیشتمە بەر دەرگای ماڵی ئاغام. قوماشێکی ڕەش کە بە ڕەنگی سەوزی لەسەر نووسراوە، بەسەر دەرگای دەروازەدا داتەپیوە. دیسان پێش چاوم بۆ ماوەیەک تاریک داهات. خۆشەویستی و هەڕەشەکانی ئاغام، وەک شریتێکی خێرا بەبەر چاومدا رادەبرن. هەموو ئەو ژیانەی لە ماوەی ئەم چەند ساڵەدا کە کوڕی سەفەرعەلی بولۆت ئۆغڵوو بووم، تیژ تێدەپەڕێت. لەم ماوە کورتەدا ساڵ بەساڵ و مانگ بەمانگ و تەنانەت سەعات بە سەعات و دەقە بە دەقەی ئەو ژیانە هەست پێدەکەم. هەوڵ دەدەم بەر بە گریانەکەم بگرم. ئاغام لەبەرچاوم زیندوو دەبێتەوە و لەپڕمەی گریان دەدەمەوە. مامان بەهەموو هەستی خۆشەویستیی دایکانەیەوە باوەشم پێدا دەکات، گریانم بۆ راناوەستێت. باوەشی دایک زوو ئارامم دەکاتەوە. هەست بە بچووک بوونەوە دەکەم. پێموایە لەباوەشی ماماندا گەڕاومەتەوە ئەو سەردەمە کە پێموابوو باوەشی مامان لەهەموو مەترسییەکم دەپارێزێت. کەسوکاری بولۆتئۆغڵوو یەک یەک لەباوەشیانم دەگرن و بەسەرمدا دەگرین. خوشکەکانی ئاغا سەردوولکەی بۆ دەهۆننەوە و پێیدا هەڵدەڵێن. سێ چوار کەس دەورم دەدەن و بە زۆر لە مەجلیسی ژنانەوە دەمبەنە دەرەوە. بەرەو مزگەوتم دەبەن. بە گریانەوە ئاوڕێک وە دەروازەکە دەدەمەوە. بە تای نیوەکراوەی دەروازەکەدا باخچە بچووکەکەی نێو حەوشە دیارە. هەست دەکەم ئێستاش ئاغام لەسەر کورسییەکە دانیشتووە و مامان بەدەم چێشت لێنانەوە بەسەریدا دەگورێنێ.

لە مزگەوت ڕووی هەموو میوانەکان لەمن دایە. سەرەخۆشیم لێدەکەن و هیوای سەبر و خۆڕاگریم بۆ دەخوازن. هەر من و مامان دەزانین نابێ ئەم سەرساخیە بە من بگوترێت. بۆ نابێ، ڕەزا؟ ئەی سەفەرعەلی تۆی

لە منداڵییەوە بەخێو نەکرد. دەبێ ئێستا مامانیش پەشیمان بووبێتەوە. تۆ ڕۆیشتی و سەفەرعەلیش بەجێی هێشت. مامان ئێستا بە تەواوی هەست بە بێکەسی دەکات. ئەم باوەش پێداکردنەی مامان نیشانەی پەشیمان بوونەوەی بوو. نا ڕەزا واز بێنە. ئیتر ژیان لێرە بۆ تۆ نابێ. واز لەم ژیانە بێنە، ئەفسانە چاوەڕێتە. خۆت بە دنیای ئەفسانەدا بکە. هەر لەسەرەتاوە ژیانی تۆ بۆ ئەفسانە داڕێژراوە. تۆ خولیای ئەفسانەی. گیرۆدەی ئەفسانەی و هەمیشە بە دەوری ئەفسانەدا دەسووڕێیەوە. نا نا ڕەزا، هۆشت لەسەر خۆت بێ، تۆ قەرزداری مامانی. نابێ لە تەنیاییدا جێی بێڵی. لێرە بمێنەوە. مامان هەر بۆیە ئەوا بەگەرمی باوشی پێداکردی. ئەم باوەش پێداکردنەی مامان تەنیا خۆشەویستیی تۆی پێوە دیار نەبوو، پەشیمان بوونەوەیەکیش بوو بۆ ئەفسانەی مەش بایرام. ئەم باوەش پێداکردنەی مامان پەشیمانی لە هەموو ئەو قسانەی لێوە دەباری کە ئەو ڕۆژە لە ئاشپەزخانە بە تۆ و بە ئاغاتی گوت. مامان سەرەڕای هەموو تووڕەییەکانی، ئاغا سەفەرعەلیشی خۆش دەویست. لێرەبە ڕەزا، وێڕای ئەفسانەی مەش بایرام دەتوانن دڵی رابگرن و بە هەردووکتان پاداشتی چاکەی ئەم چەندساڵەی بدەنەوە. کێ دەڵێ لە شارێکی دوورەدەست بە خولیاکانی خۆت دەگەی؟ خۆ ئیدی ئاغا نەماوە تا نهێنییەکانی ژیانت بۆ ئاشکرا بکات. تەنیا ئاغا سەفەرعەلی دەیتوانی پەردە لەسەر ڕازەکانی ژیانت هەڵبداتەوە و ئەویش ڕۆیشت. تازە بۆت ناگەڕێتەوە. لەخۆڕا ڕێگەی بێداهاتوو مەگرە بەر. بمێنەوە ڕەزا، لێرە بمێنەوە.

ڕۆژی سێیەم میوانانی سەرەخۆشی لە ماڵەوە لە دەوری یەکتر کۆ بوونەوە. هەست دەکەم، خزمان هەوڵ دەدەن باسی میرات و ماڵ چاککردنەوە بکەن. رادەوەستم تا ئێوارە دادێت. شەو درەنگان ئەوکەلوپەلەم کۆ کردەوە کە دەبوایە لەگەڵ خۆمدا بیبەم. بەدزییەوە لە



ماڵ وەدەردەکەوم. هەست دەکەم کۆڵانەکەی خۆمان و دووکانەکەی مەش بایرام و مەیدانی نۆبار و هەموو تەورێز وەک خەونێک خێرا بە بەرچاومدا ڕادەبرن. هەر دەڵێی خۆم ناجووڵێم و ئەوە دار و دیوار و دارەکانی ئەمبەر ئەوبەری شەقام و باڵەخانە بەرز و نەوییەکانن بە تەنیشتمدا تێدەپەڕن و هەموویان بەرەو ماڵی سەفەرعەلی بولۆوت ئۆغلوو دەڕۆن و تەنیا من پشتم لەوێدایە. دەترسم تا ماوەیەکی کورت هەموو تەورێز بچێتە نێو ماڵی سەفەرعەلی. دەڵێی با دەمبات. بایەک هەر خۆم پاڵ پێوە دەنێت و تەنانەت گنجێکیش ناخاتە جلەکانی بەرمەوە. بایەک سووک هەڵمدەگرێت و بەرەو شوێنێکم دەبات کەخۆی نەبێت کەس نازانێ کوێیە. مێشکم ڕاوەستاوە و تەنیا تیسماڵێکی تەنکی ئەم ژیانە دەبینم کە بە سەرکوێرکراوی تێیدا سەرگەردانم. بەم درەنگانی شەوە خۆم لەبەردەم نووسینگەی مێوانخانەیەکدا دەدۆزمەوە. ڕەزا، ئەوە چ دەکەی؟ بۆچما تۆ بەتەما بووی بێیە ئێرە؟ ئەی نەتگوت تازە بۆ هەمیشە لە ماڵی مامان دەمێنیەوە؟

لەسەر قەرەوێڵە بە بێوازی ڕادەکشێم. چۆن لێرە خەو دەتباتەوە ڕەزا؟ دەبێ هەتا بەیانی لەنێو بۆنی پێخەفی ئەم موسافیرخانەیەدا بتلێیەوە. ئیدی لێرە بە تەواوی ئەرخەیان بووی تۆ بە خۆت و بە دووجانتاتەوە لەم شارە موسافیری. بێ ماڵ و حاڵ و بێ کەسوکار. ئەمشەو ئاخرین شەوی ژیانی تەورێزە ڕەزا. هەستەوە ئەم پەردەیە لادە و لەم بەرزاییەوە سەیری گڵۆپەکانی سەر ڕاستەشەقامەکە بکە. بۆ بەیانی لەگەڵ دەرکەوتنی خۆر دەبێ لێرە بڕۆی.

بەیانی لەم چوارڕێیانەی بەرانبەرت چاوەڕوانی گۆڕانی ڕەنگی کام گڵۆپ دەکەی؟ ئێستا شەقامێکی چۆڵ و بێ ماشێنە و گڵۆپەکانی هێمای هاتوچۆ وەک بە سەر تڕافیکێکی قورسدا ڕابگەن، بە نۆرە و لە کاتی خۆیاندا دادەگیرسێن و دەکووژێنەوە. ئەدی ئەگەر گڵۆپەکان

کاریان نەکرد؟ ئەوکات تا پۆلیسەکە ئیزن نەدات نابێ بپەڕییەوە. مامان گیان، خۆزگە زانیبات ئاغام ئاخرین ڕۆژەکانی ژیانییەتی و هەڕەشەی جیابوونەوەت لێنەکردبا. کێ دەڵێ، ئاغا لەکاتی پەڕینەوەدا لە شەقامەکە بیری لای تۆ نەبووە، بۆیە خۆی خستۆتە ژێر ماشێن. دەبێ پێش چاوەکانی لێڵ بووبێت و هەستی بە ڕەنگی گڵۆپەکان نەکردبێ. ئاغام هەمیشە دەیگوت، ژیانیش وەک چوارڕێیانی سەر شەقام وایە، ئەگەر نەزانی و گڵۆپی پەڕینەوەت نەناسی تووشی نسکۆ دەبی و ئەگەر نەشمری، بۆ هەمیشە لە ژیان دوا دەکەوی. من لە شەقامی ژیانی خۆمدا هەستم بە هیچ گڵۆپێک لە هیچ ڕەنگێک نەکردووە. ئەوە سەفەرعەلی بوو هەمیشە وەک پۆلیسی هاتوچۆ نا، وەک چاوساغێک ڕێگەی پێشان دەدام، ئەویشم چوو.

تۆ بڵێی ئاغام لە ترسی دواڕۆژێکی بێتۆ، بە داخوازیی خۆی نەچووبێتە ژێر تایە گرەکانی ماشێنەکە؟ مەش سەفەرعەلی بوڵوتئۆغڵوو پێیوانەبوو جگە لە تۆ هیچ ژنێک لەسەر ئەم زەویە هەبێت. ئەوکاتەی لە ئاشپەزخانە تۆ بە پێوەبووی و ئەو لەسەر کورسییەکە دانیشتبوو، بە بزەوە سەیری دەکردی. دەتگوت لە خوارەوەڕا لە دارچنارێکی بەرز دەڕوانێت. لەوپەڕی تووڕەیی و ڕواڵەتی بێزاریدا، هەستم دەکرد شایی بەخۆیەتی هاوسەرێکی وەک تۆی هەیە. هەر ئەوەش بوو لە نێوان من و تۆدا تۆی هەڵبژارد. زۆر جار هەستم دەکرد ئاغام پێی خۆشە خۆی نەویتر بێت و لەخوارەوە لە باڵای بەرزت بڕوانێت. تۆ بەرلەمردن سەفەرعەلیت رووخاند. ئەوکاتەی گوتت هەرچەند گەیشتوومەتە تەمەنێک ڕەنگە تازە منداڵم نەبێت، بەڵام مەش سەفەرعەلیی بەڕێز ئەوەندە لێک و لووس و لەبارم سەت پیاوی لە تۆ ڕاستگۆتر ملی خۆیانم بۆ دەشکێنن، ئەوکاتە هەستم کرد، ترسێکی ئاشکرا هەموو لەشی ئاغامی داگرت. ئاغام لەمێژبوو دەیزانی تۆ ئەوندە جوان و لەباری. ئەگەر واش نەبێت، ئەو تۆی لە هەموو ژنە باڵابەرزە چاو



بادامییەکانی تەورێز پێ جوان و لەبارتر بوو.

ورده ورده دنیا ڕووناک داهات و چراکانی سەر چوارڕێیانەکە نۆبە بەڕەنگەکان دەکەن. من هەروا لەبەر پەنجەرەکە بەخەبەرم، ئەوەندە دەستم خستووەتە بەر پەردەی پەنجەرەکە، ئەم لاباڵەم تەزیوە. دەڵێی وشکەدارە و بۆم نانووشتێتەوە.

خۆت کۆ کەرەوە ڕەزا، وەدەرکەوە با ئەمجاریش بەم هاوینە گەرمە، سەرلەبەیان شنە فێنکەکەی سەهەند و سەوەڵانت وێبکەوێت. ئەم جاریش بە بەر ئەم قاوەخانە سوننەتیانەدا بڕۆ کە خاوەنەکانیان بەبەر سەماوەرەکانیاندا دێن و دەچن و خۆیان بۆ ئێوارەکۆڕ و شەونشینی ئاشیقە دەنگخۆشە تار بەدەستەکان ئامادە دەکەن. بە بەردووکانی سەروپێ فرۆشەکاندا رابرە و تێر بۆنی هەڵمی قاچک و پەلەورگی کولێو بکە.

* * *

دووجانتاکەم لە ژێرزەمینەکەی ماڵی ئێوەدا بە عەردیدادا. یەکەمجار ناوی شاری گێلاساوام لە تۆ بیستبوو. خۆت پێتخۆشبوو هەمووکەس بەم شارە بڵێن گێلاساوا. منیش ئەوەندەی ئەم ناوەم بەدڵ بوو، ئەوەندەی دیکەش هەستی خۆشەویستیی تۆی لەدڵمدا دەورووژاند. بەڕاستی گێلاساوا بوو. هەستم بە جوانیی ئەم باغانە دەکرد کە بەهاران لقی دارەکانیان لەبەر قورسایی بەری گێلاسە سوورەکان بەرەو زەویی دەنەوینەوە. جارجار خۆشت لێم دەبووی بە گێلاس. کاتێک گێلاسێکی سووری ئاودارم دەنایە نێو دەممەوە، هەستم دەکرد پێستە ناسکەکەی تۆ بە لێوم دەنگێوم. پێمخۆش نەبوو ئەم گێلاسە ناسکە لەنێو ددانەکانمدا بتەقێنم و گنجی پێستە سوورەکەیان لەژێر چەرخی ددان و زمان و پووک و مەڵاشوومەوە هەلا بەهەلا بێت. حەیفە پێستی لێک و لووسی گێلاس ئەم ئاوە زیندووەی لەپشت نەبێت و بپەنمێت و بپووچێتەوە.

هەرچەندە ئێستە هاوینە و وەرزی رنینی گێلاس تەواو بووە، بەڵام هەست دەکەم ئێستا ئەم شارە بۆنی گێلاسی لێدێت. هەر کەس بەهاران بەنێو سپیەی پڕلە گێلاسی ئەمبەر ئەوبەری جادەکاندا تێپەڕێت، لە وەرزی زستانی ئەمشارەشدا هەست بە بوونی گێلاس دەکات.

رەزای بوڵووت ئۆغڵوو، ئەو باوکەشت مردا! هیوای شاهیدیدان بۆ وەرگرتنی میراتی مام میرۆ لەگەڵ سەفەرعەلی بوڵووت ئۆغڵوو ئەوە چەند شەوە لە گۆڕستانێکی تەورێز لەژێر خاکدایە. تۆ بڵێی سەفەرعەلی زانیاریی نادروستی نەدابێتە مامان؟ ئەو لەهەمووکەس باشتر دەیزانی من کوڕی کێم.

خۆزگە وەک ئاغام دەیگێڕایەوە، سەردەم سەردەمی کۆن بوایە و تەورێز تاقە ماشێنێکی لێنەبا. لە جیاتی ئەم ماشێنانە، ئەسپەکان فایتۆنیان ڕاکێشابا و تەقەی ناڵەکانیان بەسەر خیابانە بەردڕێژ کراوەکاندا تێکەڵ بە خەیاڵاتی ئاغام ببا. ئاغام لە پەنا گێڕانەوەی مێژوودا، سەربردە و بەسەرهاتی منی درکاندبا و گرێ کوێرەی ئەم ژیانەی بۆ کردبامەوە. کوڕە هۆی سەفەرعەلی بوڵوتئۆغڵوو، چۆن ئەم رازەت لەمن دیزە بەدەرخۆنە کرد، ئاواش هیچت لای مامان نەدرکاندبا. نا نا، ئەوکات مامان قبوڵی نەدەکرد. هەر دەبوو تێتگەیاندبایە من لەکوێوە هاتووم. نا، هیچ تاوانێکت نییە ئاغام. یاخوا گۆڕەکەت پڕ بێ لەنوور. تۆ چاکەت لەگەڵ من کردووە. بەڵێن بێت هەرکاتێک ڕێم بکەوێتەوە تەورێز، خۆ بگەیەنمە سەر گۆڕەکەت و دیدارت لەگەڵ نوێ بکەمەوە. میراتی تۆ چ لێ بکەم؟ من تەنیا میراتگری ئەم هەموو چاکەیەی تۆ بووم. بەڵێن بێت وا خۆم بشارمەوە، هەرچی تایفە و دۆست و ناسیاوی بوڵوتئۆغڵوویە، نەمدۆزێتەوە.

– زەحمەتی تۆ لازم نییە، دایە مەرجان. خۆم هەموو شتێک لەبازاڕ دەکڕم.



– نانا کاکە رەزا گیان، زەحمەتی چی؟ بەخودای ئەوەی ئێمە هەمانبێت، ناهێڵم بیکڕی.

بە بەزەییەوە لێم دەڕوانێت. ئەفسانە لەسەر قاڵدرمەکانی نهومی سەرەوە وەک شاژنێکی دەستەڵاتدار دەڵێی هەموو ئەوناوەی خستۆتە ژێردەستەڵاتی خۆیەوە. دایە مەرجان جامانە شۆڕاوەکە لەسەر تەنافەکە کۆدەکاتەوە. بۆنی دەکات. لەباوەشی دەگرێت و بە قاڵدرمەکاندا سەردەکەوێتەوە. ئاوڕێک دەداتەوە و جامانەکە دەکاتەوە و بەسەرشانیدا دەدات.

– کاکە گیان، ئەوەندە فکرانی لێ مەکەوە. جارێ وەرەسەرەوە چایەکی وەخۆ و تاوێک بحەسێوە.

مام بارام جامانەکەی کەمێک لە نێوچاوانیەوە بەرەو تەوقەسەری هەڵدەکێشێت و بە سەر چاویلکەکانیدا یەک بەیەک لێمان دەڕوانێت. ئەوانەی لەم شەونشینیەدا بانگهێشتن کراون یەک یەک و دوو دوو وەژوور دەکەون. سەرلە بەیانیی ئەوڕۆژە، بەبەرئەو دووکانەدا رادەبردم کە یەکەمجار کابرا جامانە بەسەرەکە بانگی کردمە ژوورەوە. کابرای دووکاندار لە ژوورەوەڕا لە جامی دووکانەکەیدا و بە دەست ئاماژەی کرد بچمە ژوورەوە. وەژوور کەوتم، موشتەرییەک بەرانبەری مێزەکەی راوەستابوو. راوەستام تا موشتەرییەکە وەدەرکەوت.

– زۆر بەخێر بێی. پێش ئەوەی بێرەدا رابری، بیرم لەوە دەکردەوە چۆن بتبینمەوە. ئەمشەو لەیەکێک لەم گوندانەی بنار بانگێشتن کراوین. مام بارامیش لەوێیە. بە باشمان زانی تۆش بەشدار بی.

– مام بارام کێیە؟

– هەر ئەو کابرایەیە کە ئەو ڕۆژە لێرە دیتت و پاشان لە ماشێنەکەوە بانگیان کرد و ڕۆیشت.

– پیاوێکی خونگەرم بوو. ئاخر من ئەو ماڵە ناناسم کە ئێوەیان دەئوەت کردووە.

– ئەوان دەتناسن. هەموویان لەخۆمانن.

– ئەفسانە، لە دووکانێکی نێو بازاڕ پیاوێک بە ناوی مام بارام بووەتە برادەرم. پیاوێکی خونگەرمە. سنی شێست ساڵ دەبێت. جامانەکی بچووکی بەسەرەوەیە و عەینەکێکی ئەستووری بچووکی کردۆتە چاو. زۆر قسە خۆشە.

– پیاوێکی کەمێک کورتەباڵای دەم بە پێکەنینە؟

– ڕاست بۆخۆیەتی. ئەمشەو لە گوندێکی بنار میوانیان کردووم. گوتم با پرست پێبکەم و ئاگادارت بکەمەوە. لەگەڵیاندا بچم؟

– بچۆ، بەڵام ئاگات لە خۆت بێت.

– تێنەگەیشتم. بۆچی ئاگام لەخۆم بێت؟ ترسێک یان تەهدیدێک لە میان دایە؟

– نا، ناسینی ئەم پیاوە زۆر بەکەڵکت دێت. بەڵام با دایە مەرجان بەم کارە نەزانێت و لەوێش زۆر باسی خۆتیان بۆ مەکە. لەوێ میوانەکان زیاتر گوێ دەدەنە مام بارام و چەند کەسی دیکە. حەتمەن دەبێ باسوخواسی ئەم میوانداریییەم بۆ بگێڕیەوە.

– بەسەرچاو ئەفسانە خانم. ببەخشە ئەفسانەی رووت، هاهاهاها....

– برۆ دەی. دیارە لەوە قۆشمەتری بیرم لێ دەکردەوە. ئەوەندەش بەستەزمان نی.

لە شەقامی بەر دووکانەکە، پیاوێکی ڕەنگ گەندومی ماشێنەکەی ڕاگرت و دووجار چراکانی هەڵکرد و کوژاندنیەوە. دووکاندارەکە گوتی، کاک ڕەزا فەرموو لەگەڵ ئەم ماشێنە سواربە. من لەگەڵ یەکدوو برادەری دیکە دێم. ناوی کاک ئەحمەدە. بەپارێزەوە سڵاوم کرد و لە تەنیشتی دانیشتم.

– زۆر بەخێر بێی کاک ڕەزای بەڕێز.

– مەمنوون خاهیش دەکەم. جەنابتان ئەحواڵتان باشە؟



دەتگوت، هۆشی لێرە نییە و بیر لە شتێک دەکاتەوە. نازانم وەڵامی دامەوە یان نا. پێی لە ماشێنەکە گوشی و دووکان و بڵوار و دارە جەنگەڵییەکانی ئەمبەر ئەوبەری شەقامەکان یەکیەک بەجێ دەمان. لەشار دەرکەوتین. چەند کیلۆمترێک بەرەو باشوور ڕۆیشتین و لەوبەر ڕووبارێک بەرەو ڕۆژئاوا سووڕاینەوە.

– هەی پەری عەمرم پەری
قورنگی چۆمی گادەری
دەبرۆ دایکت رازیکە
بۆخۆم دەبمە مشتەری...

پێش ئەم گۆرانییە، بە کۆخەیەکی دەستکرد قوڕگی خاوێن کردەوە و هەوڵیدەدا تۆنی دەنگی سەرنجم ڕاکێشێت.

– ئەوچۆمە، چۆمی گادەرە. ئاوەکەی لەسەر سنوورە دەستکردەکانی نێوان عێراق و ئێران و تورکیاوە کۆ دەبێتەوە و دوای ئەوەی ئەم دەشتە پاراو دەکات، دەڕژێتە دەریاچە سوێرەکەی ورمێوە.

سەرم لەوە سووڕمابوو، ئەوانەی لەم سەروبەندەدا تێکەڵیان دەبووم، هەموویان خۆتئاسایی زمانێکی خۆشیان هەبوو. زۆر خۆمانە و بێپەردە لەگەڵم دەدوان. دەتگوت، لەمێژ ساڵە دەمناسن. سەرەڕای ئەمەش، زانیاریی تازە لەدەمیان دەباری. بە ڕۆخی باشووری ڕووبارەکەدا بەرەو بنار هەڵکشاین. خۆر خەریک بوو دەکەوتە ئەودیو کێوە بەرزەکانی بنارەوە. بەفری زستانی رابردوو وەک خاڵخاڵی سپی بە جۆمایی و شیوەکانی نزیک لووتکەی کێوەکانەوە دیاربوو. هەوایەکی فێنک و پاک خۆی بەنێو ماشێنەکەدا دەکرد. جۆگە و دارستان و دارچنار و دارسێوەکان دەتگوت، خەونێکی کۆنن نوێ دەبنەوە. گەڵای چەوەندەر ڕووبەری چەند پارچە زەوییەکی داپۆشیبوو. نێوە نێوە پەرێزە گەنمەکان خاڵی زەردیان دەخستە نێوان زەوییەکانەوە.

دوای ئەوەی بەچەند کۆڵانێکی تەنگەبەر و ناڕێکدا بەنێو کۆمەڵێک خانووی قوڕ و بلۆکدا سووڕاینەوە، لە بوومەلێڵی ئێوارەدا لە بەر دەروازەیەکی دوودەریی گەورە دابەزین. پیاوێکی تەمەن مامنێوەندی بەرەوپیرمان هات و بە گەرمی بەخێری هێناین. ئەحمەدی لەمن جیا کردەوە. سرتەیەکی لەگەڵدا کرد و ئەحمەد سواری ماشێنەکە بۆوە. خانەخوێ، منی وەپێش خۆیدا و گوتی: کاک ئەحمەد ماشێنەکە لەبەر دەرگای دراوسێیەکی ئەولاتر رادەگرێت و ئێستا دەگەڕێتەوە.

بەرەو دیوەخانێکی گەورە رێنوێنیی کردم. مام بارام لەلای سەروو دانیشتبوو. بەگەرمی بەخێرهاتنیان پێگوتم. بێدەنگی بەسەر ژوورەکەدا زاڵ بوو. مام بارام هەڵیدایە:

– ئەوە کاک رەزایە. موعەلیمە. لەتەورێزەوە هاتۆتە شارەکەمان و هیوادارم بۆ پەروەردە کردن و تێگەیاندنی زیاتری منداڵەکانمان هەوڵ بدات. منداڵەکان هیوای دوارۆژی ئێمەن. دەتگوت، مام بارام دەیهەوێت ترسی ئەوانیدیکە لەمن بشکێنێت.

وردەوردە بێدەنگییەکە بوو بە غەڵبەغەڵب و میوانەکان دوو دوو و سێ سێ بەیەکەوە قسەیان دەکرد. من بەتەنیا دانیشتبووم. مام بارام بانگی کردمە لای خۆی. بۆ ماوەیەکی کورت سەری هەموویان بەرەو من وەرسووڕا و لە یەکتریان روانییەوە و تێگەیشتم ئەمە هەنگاوی یەکەمی داکۆکیکردن لە خۆمانەبوونی منە. هەستم کرد ئەمە میوانداریییەکی ئاسایی نییە و ئەوانەی لێرەن ڕەنگە کارێکیان بەدەستەوە بێت کە پێویستیی بە نهێنیکاریە. ئەحمەدی شۆفیر وەژوور کەوت و بە دوای ئەودا کابرای دووکاندار و چەند کەسێکی دیکەش بەجیا هاتنە ژوورەوە. دیاربوو هەموویان یەکتریان دەناسی و لەم نێوەدا ئەوەی نامۆیی لێدەکرا من بووم. دیاربوو کابرای دووکاندار و ئەحمەدی شۆفیر لە نێو سرتوخورتەکەدا منیان بە چەند کەسێکی دیکەش ناساند. دوای نانخواردن، خانەخوێ



دەرگاکەی داخست و هەموو روویان کردە مام بارام.

مام بارام کە تا ئێستا بێدەنگ دانیشتبوو، گوتی: بەرلە نانخواردن گوێم لێبوو هێندێکتان باسی سەردەمی موسەدیقتان دەکرد. یەکێک لە لای پەنجەرەکانی لای ڕاستەوە هەڵیدایە: ئەرێ مام بارام ئەو سوپاهی دانیشانە کە دوای سەردەمی محەممەدی موسەدیق لەم نێوەدا بڵاو بوونەوە، پاش شۆڕشی ١٣٥٧ [١] چیان بەسەر هات؟

مام بارام وەک ئەوەی بەتەمابێت باسێکی دوور و درێژ دامەزرێنێت، لێوەکانی تەڕکرد و قوڕگی بۆساف کرد. ئەنگوستی وەبەر لاسکی چاویلکە قورسەکانی دا و ماوەیەک لەنگری چاویلکەکانی بەو پەنجەیە راگرت. دەتگوت دەیهەوێت لووتی لە ژێر قورسایی شووشە ئەستوورەکاندا پشوویەک بدات یان بە ژێر چاویلکەکانیدا لە ئاسۆی خولیاکانی دەڕوانێت.

– ئەو سوپا دانیشانەی ئێوە باسی دەکەن، زۆر دوای دەستەڵاتە کورتخایەنەکەی دکتۆر محەممەدی موسەدیق و کودەتاکەی ٢٨ی گەلاوێژی ساڵی ١٣٣٢بەم نێوەدا بڵاوکرانەوە و پاش کۆتایی هاتنی رژێمی پاشایەتیش بە یەکجاری کۆیان کردنەوە.

دوای ئەوەی دکتۆر موسەدیق توانی بەسەر دەستەڵاتی پاشایەتیدا زاڵ بێت و ئیمتیازی نەوتی ئێرانی لە دەست ئینگلیزەکان دەرهێنا، ئێوارەی رۆژی ٢٨ی گەلاوێژی ساڵی ١٣٣٢ی هەتاوی، هێزەکانی ئەرتەش توانیان لە کودەتایەکی لە ناکاودا موسەدیق وەلابنێن و شا بگەڕێننەوە سەر تەختی پاشایەتی. محەممەد رەزاشای پەهلەوی دوای هاتنە سەرکاری موسەدیق، رایکردە بەغدا و لەوێوەش ڕۆیشتە رۆم. ئەو کاتە بوو ئێمە لەگەڵ جەماعەتێکی زۆر لە جووتیارانی ناوچەی بۆکان و چۆمی مەجیدخان کە دەکەوێتە دەوروبەری شاری میاندواو، ناچار بووین لەدەست ئاغاکان هەڵبێین و بەشێکی زۆرمان لەم دەوروبەرانە

١- ١٩٧٩ زایینی

گیرساینەوە. جووتیارانی ناوچەکە لە سەردەمی دەستەڵاتی موسەدیقدا لە ئاغا و ساحێبمڵکەکان راپەڕیبوون و زۆربەی ئاغاکان لە گوندەکان لەدەستانیان هەڵاتبوون. ئەوکات خەباتی چینایەتی لەم ناوچەیەدا بەهێز بوو. دوای ئەوەی موسەدیق لەدەستەڵات کەوت، ئاغاکان لەژێر پشتیوانیی شادا گەڕانەوە و ئێمەیان لە گوندەکان راونا. ئەوکات سەردەمی دەستەڵاتی ئاغاکان بوو. ئێمە رەعیەت بووین و دەبوایە ئاغای گوند ئیزنی دابا لە گوندەکە بین و کاری پێکردباین. ئەو خاوەنمڵکانەی دراوسێی گوندەکانی ئێمە هیچکامیان رایاننەگرتین. ئێرەمان پێ شوێنێکی باش بوو. ئەودەم من مێرمنداڵ بووم. بەتەمەنترەکان دەیانگوت، رەنگە خاوەنمڵکەکانی ئێرە لەبەر ئەوەی خزمایەتییان لەگەڵ ئەوانەی لای خۆمان نییە و لە عەشیرەتی جیاوازن، رەنگە وەک رەعیەت و کارەکەری مووچە و مەزرا رامانبگرن. ئەگەر راشیان نەگرتین، روودەکەینە گەرمێن[1] و لەوێ دەگیرسێینەوە. ئێمەش ناوچەبەناوچە و گوندبەگوند هاتین و گەیشتینە ئێرە. لەو وەختەوە لێرە گیرساینەوە. ئەم شارە و دەوروبەری بۆتە پەناگای ئێمە. زۆر کەسی دیکەش کە لە کوردستانی تورکیا و عێراقەوە هاتوون، لێرە گیرساونەتەوە. بەهۆی جوغرافیای ئەم شارە کە دەکەوێتە سەر سنووری سەپاوی ئێران و عێراق و تورکیە، بووەتە پەناگای زۆر کەسان. ئێرە پڕە لەموهاجیر.

چەند ساڵ دوای ئەو رووداوە، شا بە رێنوێنیی وڵاتانی دەستەڵاتداری وەک ئەمیرکە و ئینگلیس دەستی بە ئیسلاحات کرد. چونکە لەو ئیسلاحاتەدا بەشێک لە زەوی ئاغاکان بەسەر جووتیاراندا دابەش کرا، لێرە نێوی ئیسلاحاتی عەرزیان لێنا. شا لەو ئیسلاحاتەدا هێندێک کاری باشیشی کرد. حکوومەتی ئەوکات ناوی ئەم ئیسلاحاتەی نا ئینقلابی سپی. دەیهەویست بڵێت ئینقلابێکی بێ خوێنڕشتنی ئەنجام داوە و هیچ

١- مەبەست لە گەرمێن، باشووری کوردستانە



خوێنێک نەڕژاوە، بۆیە ناوی لێنابوو ئینقلابی سپی. ئەوەندەی لەبیرم مابێت، بەرنامەی ئینقلابەکە لە ٣٠ خاڵ پێکهاتبوو. یەکێک لەو خاڵانە دامەزراندنی سوپای دانیش بوو. بۆ دامەزراندنی سوپای دانیش، ئەو کەسانەی دەچوونە سەربازی ئەگەر خوێندنی دیپلۆمیان تەواو کردبایە، دوای دەورەیەکی سەربازی، دەکران بە موعەلیم. ماوەی دووساڵی سەربازییەکەیان دەبوایە لە گوندەکان دەرس بە منداڵان و گەورەکانیش بڵێنەوە. سەرەڕای ئەوانە هێندێک لەو سوپاییانە بەناوی دیکەی وەک «سوپاهیانی بێهداشت و تەرویج و ئابادانی»[1] یارمەتیی جووتیارانیان دەدا و هەوڵیان دەدا رێنوێنییەکانی تەندروستی و لەشساغی و پاکوخاوێنی فێری گوندییەکان بکەن. ئەوە کارێکی باش بوو. دوای ئەوە لە دێهاتەکان مەدرەسەی ئیبتدایی دروست کران و خەڵکیش منداڵەکانیان دەبەر خوێندن نا. ئەگەر لەبیرم بێت ئەو ئیسلاحاتە لە ٦ی رێبەندانی ساڵی ١٣٤١ی هەتاویدا[2] لە راپرسییەکدا دەنگی پێدرا. یانی نزیکەی ١٠ ساڵ دوای رووخانی دەستەڵاتە کەمتەمەنەکەی موسەدیق. بۆیە باسی سەردەمی دکتۆر موسەدیقم کرد، زۆر کەس وادەزانن حکوومەتی ئەو کاتی، پاش دەستەڵاتە کورتخایەنەکەی موسەدیق، لە ترسی ئینقلابی ڕاستەقینە و هەستانەوەی خەڵک لە دژی شا، ئیسلاحاتی ئەنجام داوە. وا نەبوو، دە ساڵ دوای لەسەرکارلادانی موسەدیق ئەم ئیسلاحاتە دەستی پێکرد. هۆکارەکەشی بە تەنیا سەرهەڵدانەکەی موسەدیق نەبوو. لە هەموو دنیادا شۆڕش و کودەتا و ئاڵوگۆڕی بنەڕەتی روویان دەدا. هەر لەو ئێراقەدا لەسەریەک کودەتا دەکران و سەرۆکەکان

١- سوپاهیانی بێهداشت و تەرویج و ئابادانی، ئەو کەسانە بوون لە جیاتی ٢ ساڵی سەربازی لە هێزە چەکدارەکانی سەر بە پاشایەتیدا بە پێی پسپۆڕیی خوێندنیان لە بواری کاروباری تەندروستی و گەشە و ئاوەدانکردنەوە خەڵکی نەخوێندەواری گوندەکانیان رێنوێنی دەکرد و بە پێی توانا شتە نوێیەکانیان فێر دەکرن.
٢- ١٩٦٣/١/٢٦ زایینی

دەگۆڕان. لە تورکیەش وێڕای ئەوەی تورکە ڕەگەزپەرستەکان دوای ڕووخانی دەستەڵاتی عوسمانییەکان هاتبوونە سەر حوکم، لەوێش ژەنەڕاڵە تورکەکان بە کودەتا دەستەڵاتی سیاسییان دەگۆڕی. وەک دەڵێن بە چاوساغیی ئەمریکا و ئینگلیس بوو شای ئێران ئەو ئیسلاحاتەی کرد. شا بەوکارەی دەیهەویست خەڵک ڕانەپەڕن و بە وڵاتانی دونیاش بڵێت، ئەوە ئێمەش ئینقلابمان کردووە.

هەرچەندە خۆم لە قوتابخانە بەشێک لە مێژووم خوێندبوو، بەڵام لە کتێبەکانماندا ئەم ڕووداوانە بە شێوەی دیکە دەگێڕدرانەوە. ئەوەی مام بارام دەیگوت هەمووی بۆ من زۆر سەرنجڕاکێش بوون.

لە کاتی قسەکانی مام بارامدا خانەخوێ و یەک دوو کەسی دیکە نێوە نێوە هاتوچۆی دەرەوەیان دەکرد. من قسەکانی ئەم پیاوە پیرەم ئەوەندە پێخۆش بوو، گوێم نەدەدایە ئەو دڵەڕاوکێیە. مام بارام بۆ ماوەیەک بێدەنگ بوو. بێدەنگییەک بەسەر دیوەخانەکەدا زاڵ بوو. لەم بێدەنگییەدا هەتا بڵاوە کردنی کۆبوونەوەکە لەوێ دابڕام و گەڕامەوە لای ئاغام و مام میرۆ. هەستم بە سووک بوونێک دەکرد. لەوکاتەدا بیرم لە ئاغام دەکردەوە ئاخۆ ئەگەر هاتە گوندەکەمان چۆن هەستی بۆ لای من جووڵا و منی لە مام میرۆ وەرگرت. خۆزگەم دەخواست دوای ئەم زانیارییانە، ئاغام زیندووبایە و بەوردی سەبارەت بە چۆنیەتی هاتنی بۆ گوندەکەمان پرسیارم لێ کردبا.

ئاغا بۆ پێت نەگوتم مام میرۆ چۆن منی لەم دەشت و دەرە دۆزیوەتەوە؟ ئاخۆ چەندە بە تەنیایی لە نێو داروەدەوەنەکان فڕێ دراوم؟ تۆ بڵێی دایکم ئێستا مابێت؟ بڵێی جارێکی دیکە تووشی نەبمەوە. زۆر ناخۆشە لە شوێنێک لەدایک بووبی. هەست بکەی دایکت لەم شوێنەیە و نەشیناسییەوە. ناچاری لە تەواوی ژنە بەساڵاچووەکانی ئەم شوێنە دوودڵ بی، نەکا یەکێک لەم ژنانە بۆ ماوەی نۆمانگ و چەند ڕۆژ تۆی لە



ڕەحەمی خۆیدا ڕاگرتبێ. ناتوانی پڕ بەدڵ سەیری ئەم کچە باڵابەرز و خوێن شیرینانەی پەروەردەی هەوای سازگاری ئەم نێوەبکەی، نەکا لەو ژنە لە دایک بووبن کە دایکی تۆشە. ئەوکاتە دڕدۆنگ دەبی نەکا یەکێک لەم کچە جوانانە خوشکی تۆبێت. خۆ ئێستا نازانم ئەفسانەش چۆن لەدایک بووە. پێمخۆش نییە ئەفسانە لە ڕیزی ئەم کچانەدا بێت. خۆزگە ئێستا مام میرۆ نەمردبا و لە جیات ئەوەی دوای میراتەکەی بکەوم، دەمپرسی خەڵکی گوندەکە لەبارەی منەوە چیان پێگوتووە. ئەو ژنانەی شیریان داوە بە من، ئاخۆ نەیاندەزانی من لە پێکگەیشتنی ناشەرعیی کام جووتە ژن و پیاوی ئەم دەڤەرە لەدایک بوومە؟ تۆ بڵێی یەکێک لەو پیاوە بەتەمەنانەی نێو ئەم دیوەخانە باوکی ڕاستەقینەی من نەبێت؟ دانیشتووانی دیوەخانەکە وەک چەند تارماییەک دێنە بەرچاوانم. پێش چاوم وەک وێنەیەکی سێڕەهەندیی لێدێت. لە نێوەندەکەیدا پیاوێک دێتە پێشەوە. باوەشم پێدادەکات.

– ئەوە لەکوێی کوڕی خۆم؟ بەدرێژایی ئەم ساڵانەدا بەدواتدا دەگەڕێم. واز لە میراتەکەی مام میرۆ بێنە. وەرە سەیری ماڵەکەم کە. ئەم هەموو مەڕ و بزن و زەویوزارە بەکێ ڕەعەمەل دێت؟ قۆڵی لێ هەڵماڵە و بەساحێبیان بکە.

– باوکە گیان، ئاخر من موعەلیمم. تازە بۆم ناکرێت بە مەڕداری و زەوی و زار ڕابگەم.

– دەی باشە چاکتریش. خۆ منیش خەنی دەبم. هەر لەم گوندەی خۆمان ببە بە موعەلیم و دەرس بە منداڵان بڵێوە.

منداڵینە بێدەنگ بن! ئاغام بەمجۆرە لە پەنجەرەی مەدرەسەوە لە دەرەوەی دەڕوانی. ئەم شووشە پەنجەرەیە چەندی تۆز لێنیشتووە؟ پەنجەرەکە دەکەمەوە. ئەم کچەتیوە بەم جلە کوردیانەوە چەندە جوانە. هەتا دەست هەڵێنی باڵابەرزە. دەڵێی ئەفسانەیە.

نابێ ڕەزا، وانابێ! لێرە لەم گوندە دەبێ زۆر بەپارێزبی. ئاخر ئەوە نییە بەشێکی زۆری ژنانی ئەم گوندە شیریان پێداوی؟ چۆن دەزانی ئەم کچە باڵابەرزە کچی یەکێک لەو ژنانە نییە؟ باشە ئەگەر وابێت، خوشکی خۆتە. لەمەودوا تۆ تەنیا ئەفسانەت هەیە. لە ڕاست کچانی ئەم گوندە واز لە هەموو خۆشەویستییەک بێنە. نا نا، خۆشت بوێن. وابزانە هەموویان خوشکی تۆن. شیری دایکی هەر کامیانت خواردبێ، دەبێتە خوشکت. ئەفسانە دەرگای سووچی دووکانەکە دەکاتەوە. لە پشت مەش بایرامەوە، ماچێکم بۆ داوێت. بێدەنگ بن منداڵینە. ئەوەندە سەبرم لێبگرن تا ئەفسانە بە تەواوی فێری خوێندن و نووسینی زمانی کوردیم دەکاتەوە. منیش هەمووتان فێری خوێندنەوە و نووسینی ئەم زمانە شیرینە دەکەم.

ئەفسانە دەکەمە سەرچاوەی کانیاوێک لەمنەوە هەموو منداڵانی گوندەکە پاراو بکات و ئێوەش هەر یەکێکتان چەند کەسی دیکە فێرکەن. بەمجۆرە ئەفسانە بۆ هەموو خەڵکی ئەم نێوە و بەرەکانی داهاتوو دەبێتە سەرچاوە. هەر سەرچاوەشە. هەر دەڵێی من لە ئەفسانە بەدەر هیچ سەرچاوەی دیکەم نییە.

– شەومان درەنگ کرد. وردە وردە با هەستین. تا دەگەینەوە، درەنگتریش دەبێت. بەڵام وا باشە هەموومان پێکەوە وەدەر نەکەوین. لەو سەرەوە چۆن هاتووین، لێرەوەش ئەوا لێک جیادەبینەوە و بەرەو ماڵ دەڕۆینەوە.

لێرەدا وەخۆ هاتمەوە. شەرمم کرد ئاگام لە درێژەی قسەکانی مام بارام براوە. خانەخوێ هەوڵیدا من لەگەڵ ئەحمەد نەڕۆمەوە و شەو لای ئەو بمێنمەوە. تاسەی دیتنەوەی تۆ لێنەگەڕا.

* * *

– ئەفسانە ئەم جامانە پیاوانەیە چییە کردوتە ملت؟

– داستانی ئەم جامانەیە دوورە.



– ئەمە هەر ئەو جامانەیە نییە ئەوڕۆژە دایە مەرجان لە تەنافەکەی کردەوە و بە باوەشیەوەی نا؟

– با، من و دایە مەرجان هەردووکمان ئەم جامانەیەمان خۆش دەوێت. من کە بەیانیان لەبەر سەرما دەیکەمە ملمەوە هەست دەکەم باوکم لەباوەشی گرتوومە. دایە مەرجانیش بە جۆرێکی دیکە خووی بەم جامانەیە گرتووە.

– ئەم جامانەیە هی کێیە؟

– پێش ئەوەی باوکم بە یەکجاری جێمان بهێڵێت، لە بەیانیەکی سارددا ئەم جامانەیەی بە سەر شانی دایکمدا دا. دایە مەرجان ئەو کات هەڵدەلەرزی. ئێستا دەڵێم، ڕەنگە ئەو لەرزینەی بەهۆی سەرماوە نەبووبێت.

هەردوو وێنەکانی سەر مێزی تەلەفزیۆنەکە و ئەوەی سەر کتێبخانەکەی ئەفسانە جامانەیان بە سەرەوە بوو. تا لە ئەفسانەم نەپرسی، نەمدەزانی ئەم جامانەیە هی کامیانە. زۆربەی خەڵکی ئەم شارە جامانەیان بەسەرەوەیە. هێندێکیان لێیان دێتەوە. حەزم چووەتە جامانەکەی سەری مام بارام. دوو وێنەکەی هەر دوو ژووری ماڵی ئەفسانە جامانەکەیان لەشێوەی جامانەی مام بارام بەستووە. بڵێی ئەوەندەی مام بارامیش شارەزا بن؟

* * *

بەرەو دواوە لە تەپۆڵکەی چیاکە ئاوابووم. کاری دەست بەئاوگەیاندنم هەبوو. لە هاوڕێکانم و قاچاخچییەکە نەدیبووم. بەرەو ئاوی خوڕێنی نشێوەکەی لای دەستی ڕاستم سووڕامەوە. لە سەر ئاوەکە دانیشتم. خەیاڵم ئاو بردی. ئەگەر خۆم بەم ئاوە دابێڵم دەچمەوە نێو دەریاچە سوێرەکەی ئەم دیوەی تەورێز. ئەگەر ئەم ئاوە تێکەڵی چۆمی گادەر بێتەوە، لەسەر پردەکە، لەوشوێنەی ئەحمەد بەدەم ماشێن ئاژۆتنەوە

گۆرانی ئەی پەری عەمرم پەریی چڕی، لادەدەم و خۆم بە شاری گێلاساوادا دەکەمەوە. لێدەگەڕێم تاریکان دابێت و یەکسەر لە تەنیشت گەڕەکی بونیادی شەهید لە ئەفسانە وەژوور دەکەومەوە. ئەفسانە لە ترسان جامانەکە بەسەر سەروچاویدا دەدات و بە هەناسەبڕکێوە لای دەداتەوە. چییە ئەفسانە بۆ وا حەپەسای؟ دەڵێی قەت منت نەدیوە؟

نا، وا ناکەم ئەفسانە تووشی ترسان بێت. بەرەو دەریاچەکە بڕۆم باشترە. ئەم دەریاچە سوێرە بۆ مەلەکردن زۆر خۆشە. ئەگەر لە مەلەکردنیش ماندووبم، لەبەر سوێریی ئاوەکە داناکەوم و ناخنکێم. سووک خۆم بە دەریا دەسپێرم. چەند خیارێک بە دەستمەوە دەگرم. بۆ ئەوەی خوێاوکەکە نەچێتە چاومەوە. نێوەنێوە قەپاڵتەیەک لە خیارەکە دەدەم و بە جێگەی قەپاڵتەکە کە هێشتا ئاوی سوێری دەریاکەی وێنەکەوتووە، چاوم لە سوێراوکەکە پاک دەکەمەوە. ئەمەش لە ئاغام فێربوومە.

بەسەر دەریاچەکەدا مەلە دەکەم. هەتا لێواری لای تەورێز دەڕۆم و لە رۆخەکە دەڕوانم، بەڵکو ئەفسانەی مەش بایرام لەولاوە خۆ بە دەریادا بکات. مامان دەیگوت، ئاوی دەریاچەی ورمێ حەوت ئازار لە لەش دەپەڕێنێت. بە سەرئاوەکەدا بۆلای رۆخی لای خۆرئاوا دەسووڕێمەوە. تۆ بڵێی ئەفسانەی خۆم لە ژێر کام شەپۆلی ئەم سوێراوەدا دەرکەوێت؟ بڵێی لەسەر راسپاردەی دایە مەرجان بۆ پێشگیریکردن لە نەخۆشبوونی پێستە ناسکەکەی خۆی لە رەڵمی شۆرەکاتی رۆخەکە وەرنەدابێت؟ سەیری ئەم رەڵمەکە! دەڵێی جێ دومبەڵانە هەڵتۆقیوە. ئێستا گێلاسە پێست ناسکەکەی شاری گێلاساوا لە جیاتی دومبەڵان لە نێو رەڵمەکەدا هەڵدەتۆقێت. هەڵیدەگرمەوە. سەیریکە، چەندە تورت و پڕئاوە! گێلاسی چی؟ ئەوە پەیکەرە جوانەکەی ئەفسانەیە و لە نێو رەڵمی لێواری دەریاکەوە بەرز بووەتەوە و بە پێوە وەستاوە. رەڵمەکە هەموو پانتایی



لەشی داپۆشیوە. ئەم دوو پەڵە ساماڵە چەندە جوانن، لەبەر شۆرابەی سینەی رەڵمەکەیان وێنەکەوتووە. دەڵێی هەور یەکپارچە ئاسمانی داپۆشیوە، دوو کونی تێکەوتووە و ئاسمانی ساف و بێگەردیان پێدا دیارە. پڕیشکە ئاوێکی سوێر چاوم ئازار دەدات. قەپاڵتەیەک لە خیارەکە دەدەم. لەنێو دەریاچەکە دام. سوێرایییەکەی لەشم دەزووڕێنێتەوە و هیچ ئەفسانەیەک لێمەوە دیار نییە.

ئەم دەریاچەیە کەوتووەتە نێوان دوو ئەفسانەکەی منەوە. نا نا، ئەفسانەی مەش بایرام ئیدی ئەفسانەی من نییە. لەمەودوا ئەوەی ئەمبەر ئاوە سوێرەکە بەڕاستی ئەفسانەی خۆمە. شەپۆلێک دێت و پێڕا ناگەم بە خیارەکە فریای چاوم بکەوم. هەردوو چاوم دەنووقێنم، لەبەر خوێاوکەکە دەسووتێنەوە. سەرم رادەوەشێنم و چاوەکانم دەکەمەوە. توورەج و تەهمینە دەستی یەکتریان گرتووە و بەتەنیشت گابەردێکدا بەرەو ئاوەکە دێنەخوارەوە. هەست بە بوونی من ناکەن. لە تەنیشت یەکتر شاڵوارەکانیان دادەماڵن. بە ئاوە ساردەکە خۆیان دەشۆنەوە. لەبەر خوڕەی ئاوەکە گوێم لە دەنگیان نابێت. پێم خۆش نییە، توورەج و تەهمینە بە ئاوێک خۆیان دەشۆنەوە کە ئاوەڕۆکەی دەڕژێتە نێوان دوو ئەفسانەوە. هەرچەندە ئەفسانەی مەش بایرام ئیدی ئەفسانەی من نییە، بەڵام پێمخۆش نییە ئەم پاشاوە بکەوێتە نێوان دوو ئەفسانەوە. تەهمینە بێئەوەی شەڵوارەکەی هەڵکێشێتەوە، هەڵدەستێتەوە. بە ژێر باڵیدا لە پشتی دەڕوانێت. توورەج دەست دەخاتە ژێر جلەکانی و لەلای پشتەوەڕا بلووزەکەی هەڵدەداتەوە. دەڵێی خەریکە لە زیندەوەرێکی ورد دەگەڕێت. کەمێک پشتی دەخورێنێت و شەڵوارەکەی بۆ هەڵدەکێشێتەوە.

ئەفسانە! بەدەم بەستنی قایشی شەڵوارەکەتەوە گوتت:

– ئەمڕۆ بڕیارە دووکارمەندی بونیادی شەهید بێن و لەبارەی چۆنیەتیی بەکرێدانی قاتی خوارەوە چەند پرسیارێک بکەن. هەوڵ بدە

لە کاتی لێپرسیندا باسی ئەوە بکەی کاتی خۆی چوویەتە بەرەی شەڕی باشوور و لە ڕێکخراوی بەسیجدا کارت کردووە. بشڵێ موعەلیمی و لە تەورێزەوە هاتووی.

– ئەی خۆت لەماڵ نابی؟

– من کارێکم هەیە، دەبێ بڕۆم. ئەگەر پرسیاریان لەتۆ کرد، وەڵامیان بدەوە. دایە مەرجانیش بۆ خۆی جوابیان دەداتەوە.

– باشە ئەوان بۆچی دێن؟

– هیچ نیە، تەنیا چەند پرسیارێک دەکەن. دەیانهەوێ بزانن ئەو کەسەی خانووی لە ئێمە بەکرێ گرتووە، چ پەیوەندییەکی لەگەڵ ئێمەدا هەیە؟

هەر ئەوکات پێمخۆش‌بوو ئەگەر پیاوەکانی بونیادی شەهید هاتن، پێیان بڵێم من زاوای دایە مەرجانم و بە خۆشحاڵییەوە لەگەڵ خانەوادەی موعەزەمی شوهەدا تێکەڵ بوومە. من و تۆ لە قاتی ژێرەوە دەژین و دایە مەرجانی خەسووشم بە تەنیا لە نهۆمی سەرەوە دەژیت. ئەگەر بونیادی شەهیدیش بەشەمووچەی تۆ ببڕێت، چ قەیدی نییە. من بە کاری مامۆستایی و تۆش بە مووچەی کارمەندییەکەت دەتوانین خانووش بکڕین. بەڵام دایە مەرجان جێ‌ناهێڵین.

دایە مەرجان دەیزانی بە تەنیا لە ژوورەکـەم دانیشتووم. لەسەر قاڵدرمەکانڕا بانگی کردم:

– کاکە ڕەزا هەستە وەرەسەرەوێ.

– قەرار نەبوو کارمەندی بونیادی شەهید بێن؟

– ئەوە بەرەبەری نیوەڕۆیە، ئەمڕۆ ڕەنگە نەیەن.

سەرنجم کەوتەوە سەر ئەو وێنەیەی لەسەر کتێبخانەی ژوورەکەی تۆ لە دەرگا نیوەکراوەکەوە دیارە. ماوەیەک بوو ئەم وێنەیە بۆم ببوو بەپرسیار. بۆچی ئەم پارچە تەنکەی بەسەرردادراوە.

– دایە مەرجان، ئەم وێنەیەی سەر کتێبخانەکەی ئەفسانە وێنەی کێیە؟



دایەمەرجان، ئاخێکی قووڵی هەڵکێشا. ماوەیەک بێدەنگ بوو. وەک لە گەشتێکی درێژەوە گەڕابێتەوە، سەری هەڵبڕی و گۆڕانێکی تەواو بە ڕوخسارییەوە دەرکەوت.

– ئامانجە.

– ببەخشە دایە مەرجان، ئەوە برای ئەفسانەبوو؟

– نا، ئەوە باوکی ئەفسانەیە.

– ئەی ئەم وێنەیەی سەر مێزی تەلەفزیۆنەکە؟

– ئەمەیان باوکی دووەمی ئەفسانەیە.

– یانی وێنەکەی ژووری ئەفسانە باوکی خۆیەتی و لەگەڵ ئێوە لەیەکتری جیا بوونەوە؟

– بەڵێ جیا بووینەوە. ئەفسانەش وەک خۆتە. چەرمەسەرییەکی زۆری دیتووە. منداڵ بوو باوکی لە دەست دا. تەنیا سایەی منی بەسەرەوە بوو...

کاتێک دایە مەرجان گوتی، ئەفسانەش وەک خۆتە، مچوڕکێکی ناخۆش لە بەری‌پێمەوە هات و لە تەوقی سەرم دەرچوو. دڵم نرکەی لێوەهات و زۆر ترسام لە دوای ئەم هەموو گەڕان و سووڕانەدا ئەفسانە لێم ببێت بە خوشک و منداڵی دایک و باوکێک بین. نەکا دایە مەرجانیش ئەفسانەی دۆزیبێتەوە و کردبێتی بە کچی خۆی؟

– ئەفسانە هیچ وەک من نییە، دایە مەرجان! من ئەلئان نە دایکم دەناسم و نەبابم. بۆ مەگەر تۆ دایکی ئەفسانە نی؟

– بەدی، ئەفسانە کچی خۆمە.

– ئەی بۆچی لەگەڵ باوکی ئەفسانە لێک جیابوونەوە؟ دیارە ئەفسانە ئەلئانیش باوکی خۆی خۆش‌دەوێت. لەبەرتۆ ئەم پارچەیەی بەسەر وێنەکە داداوە؟

– منیش باوکی ئەفسانەم زۆر خۆش دەویست.

– باشە ئەگەر وایە، بۆ لێک جیا بوونەوە؟

– لێک جیا نەبووینەوە. جیا کراینەوە.

دوو دەنکە ئەسرینی روون بەدوای یەکدا کەوتنە گنجەکانی بەرچاوی دایە مەرجان. هاتنەوەدەر و بە گۆنایدا شۆڕ بوونەوە. دایە مەرجان بێدەنگ داما. دەتگوت، کەس لەگەڵی لە ژوورەکـەدا نییە. وابزانم بە تەواوی منی لەبیر کرد.

وێنەی ئامانجی باوکی ئەفسانە لەگەڵ وێنە گەورەکراوەکەی ژووری دانیشتن، لە جلوبەرگیاندا جیاوازییەکی ئەوتۆیان نەبوو. هەردووکیان جلی خۆڵەمێشیان لەبەردابوو. چاوی ئامانج لە ژێر تۆڕە پارچە تەنکەکەوە ترس و دڵەڕاوکێیان پێوە دیاربوو. چاوەکانی مێردە شەهیدکراوەکەی دایـە مەرجانیش تـرس و دڵەڕاوکێیان لـێدەبـاری. هـەردوو وێنەکە دەتگوت بە زۆر لێوەکانیان بزەیان لێنیشتووە. ئەو بزەیەی وێنەگر داوا دەکات بەرانبەر بە کامێرا پێشانی بدەی. بزەیەک کە پێویستە تا تەقینی چاوی کامێرا پەیوەندیی نێوان دەروون و ڕوخسار بشێوێنێت. بزە دەستکردەکان لەدوورەوە دیارن. ئەفسانە دەیگوت، کاتێک ئاگام لێنەبوو وێنەم بگرە. وێنەی نێو ئاتلیەی وێنەگریەکان درۆن. تەهمینە واینەدەکرد. لەتەنیشت گابەردێک یان لە نێو چێنکی بەر زناوێکی کوێستانەکان بەنازەوە رادەوەستا و توورەجیش چاوی کامێراکەی بەڕوویدا دەتەقاند. قاچاخچییەکەش تاکاتی تەقینی چاوی کامێراکە لە لەش و لاری دەڕوانی و زۆر بە ئیشتیاوە لیکاوی تاسەی گەیشتن بە تەهمینەی قووت دەدایەوە.

من و دایە مەرجان لە بێدەنگیدا دانیشتووین. لەوێوە بە لای دەرگا کراوەکەدا لەوێنەکەی سەر کتێبخانەکەی ئەفسانە دەڕوانم. پێم خۆشە لێی نزیک بمەوە. ناوێرم. دەترسم هەودای خەیاڵی دایە مەرجان بشێوێنم.

دایـە مـەرجـان! بیر لەچی دەکـەیـەوە؟ لەنێو کـام رەهـەنـدی ژیانی رابردووتدا گیرت خـواردووە؟ شـەوان و ڕۆژانـی کاتی لاویت هاتەوە



بیر؟ بە ژانی لەدایکبوونی ئەفسانەدا رۆچوویەتەوە؟ دەتزانی کچێکی جوان وژیکەڵەت دەبێ؟ بیرت لەوە دەکردەوە کچە ژیکەڵەکەت ناو بنێی ئەفسانە؟ بۆ ئەم ناوەت بۆ دانا؟ دەتزانی چەند ساڵ دواتر رەزای نازانم کێئۆغڵوو، گیرۆدەی هەموو ئەفسانەیەک دەبێت و لەنێو ئەفسانەکاندا مەلە دەکات و بۆی ناکرێت لە دەریای بێکەناری ئەفسانەکان دەربازبێت؟ دەتزانی ئەفسانە بۆ ئەوە گەورە دەکەی ئەفسانەکانی دیکەی رەزا بخاتە پەراوێزەوە؟

رەزای نازانم کێ ئۆغڵوو! پەل مەکوتە، نە مەلەباسکە و نە پێمەلە و نە مەلەکەروێشکە ناتگەیەننە رۆخی دەریای ئەفسانەکان. ئەو کەشتیانەی بە دەریای ئەفسانەکاندا رادەبرن،هیچکامیان لات لێناکەنەوە. خەیاڵی لەنگەرگرتنی ئەم کەشتیانەش لە لێواری دەریای ئەفسانەکاندا لەسەرت وەدەربنێ. باوەش بە ئەفسانەی خۆتدابکە و بەری مەدە. تازە بۆ هەمیشە لەنێو دەریای ئەفسانەدا گیرت خواردووە.

* * *

بورهانەدین و تەیموور و توورەج و تەهمینە هەراسیان پێهەڵگرتووم. لـەوکاتـەوەی لەماشێن دابـەزیـن و کەوتینە نێو چـۆڵ و چیاکان، لە پرسیارانیان گرتم. هەموو شتێک دەپرسن. ناوی گوڵ و گژ و گیا و بەرد و کەڤر و رەوەز و دەنگی باڵندە و ناوی خزۆکەکانی ئەم چیاوچۆڵە بۆ هەموویان پرسیارن. کاتێک یەکیان پرسیارم لێدەکات، سێ کەسەکەی دیکەش بۆ وەڵام گوێقوڵاخ دەبن. تەهمینە لە هەرسێکیان کەمتر پرسیار دەکات.

ئـەم دۆڵ و دەرانــە بـۆ منیش نـامـۆن. بوومەتە وەرگـێـڕی نێوان قاچاخچییەکە و هـەر چـواریـان. قاچاخچییەکە تەنیا کاتی پرسیارە تاکوتەراکانی تەهمینە گوێم بۆ شل دەکات. توورەجیش ئەوە دەزانێت و بەدزییەوە پرسیار لە تەهمینە دەکات. تەهمینەش لەرێگەی منەوە لە

قاچاخچییەکە دەپرسێت. قاچاخچییەکە وەڵامەکان بە من دەداتەوە و بە هێواشی بزەیەک بەرەو تەهمینە داوێت. تەهمینە بە وەڵامەکە خۆشحاڵە و ڕەنگە لە بزەکەی کابراش بترسێت. هێندێکجاریش بە سووکەئیمایەک بزەی قاچاخچییەکە دەکاتە کەرەستەی زاڵبوون بەسەر توورەجدا. لەو وەختەدا بێمتمانەییەکی زۆرلاواز لەهەمبەر تەهمینەدا لای توورەج خۆی دەنوێنێت. تەهمینە هەوڵدەدات بە زەردەخەندەیەک توورەج ئەرخەیان کاتەوە. من تا ئێستا هەستێکی وام لە نێوان خۆم و ئەفسانەدا بەدی نەکردووە.

ئەوشەوە وێنەکەی سەر کتێبخانەکەت تا بەیانی نەیهێشت بخەوم. بەیانیش بە چاوە قورسەکانمەوە جێگە و نوێنی تەنیاییم کۆکردەوە. پەڕۆ تەنکەکەی لەسەر خۆی لادا.

– بۆوازم لێناهێنی؟ بۆ لەژێر ئەم تۆڕە تەنکەوە ئەوەندە سەیری چاوەکانم دەکەی؟ نەکەی نیگای من لەگەڵ نیگای وێنەکەی ئەودیو بەراورد بکەی. سەت ساڵی دیکەش ئەوا تێمڕامێنی لە رازی نیگام تێناگەی. بۆ دەست وەبەر ئەفسانە ناهێنی؟ بۆ پرسیاری منی لێناکەی؟ خۆ ئەفسانە وەک تۆ نییە. زۆربەی چیرۆکەکانی ژیانی من دەزانێت. چیدیکە بە چاوی شک و گومانەوە لێم مەڕوانە. با بەتوندی لێت نەڕەنجێم. من لێت برەنجێم، ئەفسانە هەرگیز لات لێناکاتەوە. ئەگەر دەتهەوێ ئەفسانەت لەدەست نەچێت، لێی بپرسە. مەترسە. ئەو بەوردی رازی ئەو پیاوەی پشت تۆڕە تەنکەکەت بۆ دەگێڕێتەوە. من لێرە لەپشت ئەم تۆڕە تەنکەوە هاندەری ئەفسانەم. دوای دابڕانی منیش ئەفسانە هەر لەگەڵ مندا دەژیت. چۆن تۆ خەریکە وردەوردە خوو بە ئەفسانەوە دەگری، ئەویش خووی بەمنەوە گرتووە و من ئەفسانەی ئەوم. زووکە لە ئەفسانە بپرسە، با وردورد بۆت بگێڕێتەوە و ببێت بە پردی نێوان منوتۆش. خۆ دەزانی من باوکی ئەفسانەم. ئەگەر ئەفسانە بکەیە پردی نێوان من وخۆت، بە



منیش دەگەی. ئەوکات دەزانی منیش خۆم ئەفسانەیەکم. پێت سەیرنابێت، ئەفسانە خۆی لە ئەفسانەیەکی دیکەوە بووە.

لێت تێناگەم ئامانج. تۆ پیاوی و ئەفسانە کچە. تۆ چۆن لێم دەبی بە ئەفسانە؟ من لەنێو هەموو ئەفسانەکاندا ئەم ئەفسانەیە بە هی خۆم دەزانم.

– ئەفسانە خانم، ببوورە ئەفسانەی رووت، بەخۆم ناوەستم، لەوە زیاتر خۆم پێڕاناگیرێت.

– چییە، خەریکی خۆت بێتام دەکەی؟

– من بە ناشوکری ناڵێم هەمیشە لای تۆ بێتامم. پرسیارێک ماندووی کردووم و نازانم....

– نازانی چی؟ هەرچی پرسیاری لەدڵتدایە بیڵێ.

– بۆ لەسەر کتێبخانەی ژوورەکەت ئەم وێنەیەت لە ژێر ئەم تۆڕە تەنکەدا حەشار داوە؟

– دەی باشە، ئەم پرسیارە ئەم هەموو دوودڵی و ترسەی ناوێ. ئێستا پێت دەڵێم. دوو هۆکاری سەرەکی ئەم تۆڕەیان بەسەر وێنەکەدا داوە. یەکەم ئەو کەسانەی دێنە ماڵمان ئەگەر خۆم ئیزنیان پێنەدەم، ناتوانن بێنە ژوورەکەم وئەگەر دەرگای ژوورەکەشم کراوە بێت، لە دوورەوە بەوردی سیمای وێنەکە نابینن. تۆ کە لە نزیکەوە سەیرت کردووە، لەدوورەوەش وادەزانی هەر دەیبینی. دووەم، ئەوەشم سەلماندووە خاوەنی وێنەکە لەسەر دنیا نەماوە و ئەم تۆڕە جێگەی ئەو تەمەی گرتۆتەوە کە دەکەوێتە نێوان مرۆڤە کۆچکردووەکانەوە.تۆڕە تەنکەکە، جێگەی ئەم بارستا خۆڵەی گرتووەتەوە کە مەودا دەخاتە نێوان زیندوو و مردووەکانەوە. ئەمەیانم بەخۆم سەلماندووە. ئەم تۆڕە تەنکە،سووکە تەمێکی دەستکردی خۆمە و وادەکات هەمیشە هەست بە بوونی ئامانج بکەم.

– وایە، دایە مەرجان گوتی، ئەم بەڕێزە ناوی ئامانجە و باوکی ئەسڵیی تۆیە. دایە مەرجان بە سوئالەکەی من زۆر تێکچوو. هەوڵمدا چیدیکەی ناراهەت نەکەم.

– ڕاستە، ئەویان باوکمە و ئەو وێنەیەی لە ژووری هاڵەکەشە، زڕباوکمە.

– هەر دووکیان شەهید بوونە؟

– دەزانی ڕەزا؟ دوای ئەوەی شیعرەکانی خەیامم بۆتخوێندەوە و لە پارکەکە ئەوا بە تاسەوە گوێت بۆ فێربوونی زمانی کوردی شل کرد، بە یەکجاری دڵت بردم. بەڵێنیم بەخۆمدا لێت نیزیک ببمەوە و لەدەستت نەدەم. تۆم وەک کەرەستەیەکی خاو هاتە بەرچاو کە دەبێ کارت لەسەر بکەم. ڕاستە تۆ مامۆستای قوتابخانەی، بەڵام ئێرە بۆ تۆ شوێنێکی نامۆیە. تۆ شارەزای ئەم سەرزەمینە نی. ئەم هەستەی خۆشەویستیی نێوان من و تۆ وادەکات هێندێک رازت بۆ ئاشکرا بکەم. تۆ لەمەودوا دەتوانی بە دڵی خۆت پرسیارم لێبکەی. من تینووی وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی تۆم. بەڵام مەرجم ئەوەیە لە هەر شوێنێک هەستت کرد لێم تێناگەی، پرسیاری دیکە بکەی. ئەگەر منیش زانیم تەنیا بە وەڵامی پرسیارێک ناتوانم رازیت بکەم، خۆم باسی بابەتی دیکەت بۆ دەکەم و بەرچاوت بۆ وەرگرتنی وەڵامی پرسیارەکان روونتر دەکەمەوە. بۆ وەڵامی ئەم پرسیارەت، پێویستە زیاتر پێکەوە بین.

– سەیرە هەر دەڵێی ژیانی من و تۆ لە سەرەتاوە بۆ ئەوە دەستی پێکردووە، ئێستا بەیەکەوە گرێبدرێین. ئەوەی ئێستا زیاتر هۆشی منی بەخۆیەوە خەریک کردووە، وێنەی ئامانجە. دایە مەرجان گوتی، ئەوەیان باوکی ئەفسانەیە و ئەوەی دیکەیان هاوسەری من بوو.

– تۆ دەڵێی، سەردەمی ژیانی تەمەنی چوار پێنج ساڵانەی خۆت نایەتەوە یاد. منیش وەک تۆم، بەڵام دایە مەرجان یارمەتی داوم بەشێکی زۆری ئەو ساڵانەی تەمەنم بناسمەوە. دایە مەرجان ئەوەندەی باسی



ئەم ڕۆژانە بۆ گێڕاوەمەتەوە، هەرگیز لەبیرم ناچنەوە. منیش وابزانم لە زمانی دایە مەرجانەوە بە باوکمم دەگوت، ئامانج و لەبیرم نییە پێم گوتبێ بابە. ئامانج زۆری خۆش دەویستم. دایە مەرجان دەڵێ ئامانج کاتێک دوای چەند ڕۆژ و چەند هەفتە دەگەڕاوە ماڵ، پێش ئەوەی من لەباوەش بگرێت، تۆی لەئامێز دەگرت و تێرتێر ماچی دەکردی. خۆشم لەبیرمە ئامانج هەمووجارێک کە دەهاتەوە ماڵ، پێش ئەوەی ڕەخت و فیشەکدانەکەی لە خۆی کاتەوە، منی لە باوەش دەگرت و بەخۆیەوە دەگوشیم. هەستم دەکرد گۆشەی دەراغەکان و قایشەکەی سەرشانی و نارنجۆکە رەقەکەی پێشەوەی کەمەریشی خەریکن بە خۆشەویستییەوە خۆم ڕێدەخشێنن. دایە مەرجان هاواری دەکرد کوڕە ئامانج ئەم چەکوچۆڵە لەخۆت کەوە، دیسان هەموو لەشی کچەکە ڕەش و شین دەکەیەوە. بەم ئاسنەوالانەوە وا بە خۆتیەوە مەگوشە!

ئامانج بەپەلە لە باوەشی دووری دەخستمەوە. خۆی نەوی دەکرد و بەئەسپایی لەسەر عەردەکە دایدەنام. بەدەم داماڵینی نارنجۆک و دەراغ و قایشەکەی سەرشانییەوە، بە نەرمەبزەیەکەوە سەیری دایە مەرجانی دەکرد و دەیگوت، ئەمجارەش گەڕامەوە.

شەوانە ئامانج منی لای خۆی دەخەواند و تا خەو دەیبردمەوە، حەقایەتی بۆ دەگوتم. لەبەر ئەوەی لە زۆربەی وشەکانی نەدەگەیشتم، هەمیشە ماناکەیانم دەپرسی. ئامانج ئەوەندەی مانای وشەکان بۆ دەگوتمەوە، ڕەوتی گێڕانەوەی حەقایەتەکانم لێدەشێوا. زیاتر بیرم لە مانای وشەکان دەکردەوە. ئامانج جاری وابوو ناچار دەبوو تەواوی وشەکانی نێو ڕستەیەکم بۆ مانا کاتەوە. دایە مەرجان وانەبوو. مانای هەموو وشەکانی ئەوم دەزانی. ئێستاشی لەگەڵدابێت رووداو و کەسایەتییەکانی حەقایەتەکانی دایە مەرجانم لەبیر ماون. زۆر جار وا هەڵدەکەوت لە ئامانج زویر دەبووم و دەمگوت، تۆ نازانی حەقایەتم

بۆ بڵێی. بە گۆرانیگوتن ئاشتی دەکردمەوە. ئامانج دەنگی خۆش بوو. بە دەنگی نزم و بە تاسەیەکی تایبەتەوە گۆرانی دەگوت. هێندێک جار ئامانج گۆرانی بۆمن دەگوت و دایە مەرجان فرمێسکی دەهاتنەخوار. من لووتم تێکدەنا و ئامانج گۆرانییە خاوەکەی دەبڕییەوە. گۆرانییەکی گشتی دەست پێدەکرد. دەستی بە چەپڵەلێدان دەکرد و دایە مەرجانیش وێڕای ئەو چەپڵەی لێدەدا. من چەندی دەمکرد وەک ئەوان دەنگی لێکدانی دەستەکانم بۆ کۆ نەدەبۆوە. زۆر جار بە تەنیا هەوڵم دەدا چەپڵەلێدانی وەک ئەوان فێربم.

لێوەکانی ئەفسانە بەدەم گێڕانەوەی سەردەمی منداڵی باریک دەبنەوە. دەمی ئەفسانە دەبێتە دەمی منداڵێکی پێنج ساڵان. پرچەکانی باریک و کورتتر و ناسکترن. مەمکەکانی دەپووچێنەوە و سینەیەکی سافی منداڵانە جێگەیان دەگرێتەوە. نینۆکە ڕەنگکراوەکانی دەبنەوە نینۆکی بچووکی منداڵانە. ئەفسانە بەمنداڵی چەندە جوانە!

– جار هەبوو ئامانج لەمانگێک زیاتر لێمان دوور دەکەوتەوە. ئەوکاتانە دایەمەرجانم لەپرسیاران دەگرت. دایە مەرجان حەقایەتی خۆشی بۆ دەگوتم. هەمیشە ئامانج لەنێو حەقایەتەکانیدا بوو.

«هەبوو نەبوو، بێجگە لەخوا هیچکەس نەبوو. پیاوێکی باڵابەرزی چوارشانەی قەدباریکیش هەبوو. سینگی لەچاو نێوقەدی زۆر پانتر بوو. کەواوپاتۆڵێکی خۆڵەمێشی لەبەردابوو. لەگەڵ چەند پیاوی دیکە بەرەو کانیاوێکی سارد دەڕۆیشتن. هەموویان تێنی بوون. گەرمای نێوەڕاستی هاوین شەلاڵی ئارەقەی کردبوون. پیاوە چوارشانە قەد باریکە بەژنبەرزەکە لە پێشەوەی هەموویان دەڕۆیشت. بە هەورازێکدا وەسەر کەوتن. هەر دەڕۆیشتن و دەیانگوت، تێنینە. هیچیان نەیاندەزانی کانیاوەکە چەندە دوورە. پۆلێک شینایی و گیاو گوڵ لەدووریڕا بە لاپاڵی چیا بەرزەکەوە دیار بوو. هەموویان دەیانزانی دەبی کانیاوێک لەنێو ئەو شیناوەردەدا هەبێتن.



کابرا چوارشانە قەد باریکە بەژنبەرزەکە دەیگوت، شینایی بێئاو نابێتن. هاوڕێکانی هەموویان ماندی ببوون. دەیانگوت، لاقن بۆ لەدوا نایەتن. تێنینە. لە تێنیان خنکاین. شاخەکە لە هندەک جێیان زۆر هەوراز بوو. ناچار دەبوون لەسەر چەنگان وەسەر کەون. رەفیقەکانی کابرا چوارشانە قەد باریکە بەژنبەرزەکە دەیانگوت، ڕەنگە بگەینە دووندی شاخەکەش ئاون وەدەست نەکەوێتن. ئەو دەیگوت، ئەگەر بگەینە سەر دووندی شاخی، بەسەر هەموو دەوروبەریدا زاڵ دەبین. ڕەنگە چەند ئاوی دیکە لەدوورەوە لەبەر تیشکی ڕۆژێ بریقەیان بێتن. ئەو ورەی وەبەر دەنان و زیاتر بەرەو شیناوەردەکە دەڕۆیشتن. کابرا چوارشانە قەد باریکە بەژنبەرزەکە، لەپێشەوەی هەموویان دەڕۆیشت. لەنەکاو بەسەر شیناوەردەکەدا کەوتن. جۆگەلەی ئاوەکە لەسەرەوەڕا دەهات و لە شیناوەردەکە دەمرد و پاراوی دەکرد. رەفیقەکانی بەتەمابوون گژوگیایەکە بەدەستی لابدەن و دم بە ئاوەکەوە بنێن کە بەعەردەکەدا ڕۆدەچوو. کابرا چوارشانە قەد باریکە بەژنبەرزەکە، نەیهێشت. خۆی گەیاندە سەرچاوەی ئاوەکە. ئاو لەچەند جێگا دەردەقوڵی و سەمای بە رەڵمی بنی کانی دەکرد. ئاوێکی کەڵلەتەزێن. نەتدەوێرا دەستی تێبنێی. بەنۆرە ئەژنۆیان لەسەر لێوی کانییە بچووکەکە دادا و دەستیان خستە ئەمبەر ئەوبەری، دمیان پێوەنا، تا تێریان خواردەوە. دوای ئەوەی کەمێک حەسانەوە، بەرەو دووندی چیاکە هەڵکشان. دووندی چیاکە ئەوەندە بەرز بوو، بەسەر هەموو چیاکانی دیکەیدا دەڕوانی. لەوێڕا چەندین کانیاو و چۆم و رووبار دیار بوون. کابرای چوارشانەی قەد باریکی بەژنبەرز، لەوانی دی پرسی ئێستا پێوخۆشە لەسەر کێهە رووبار یان لەسەر کێهە چیا بان؟ هەریەکەو جێیەکیان دەگوت. کابرا باڵابەرزەکە دەیگوت ئێرە لە هەموو جێیەکی خۆشترە. لێرەڕا بەسەر هەموو ئەوناوچەیەدا زاڵین. کابرا بەژنبەرزەکە هەمیشە حەزی لە جێی بڵند بوو. بۆخۆشی هەتا دەست هەڵێنی کەڵەگەت بوو.

– دایەگیان، کابرا باڵابەرزەکە ناوی چبوو؟

– نازانی؟

– نا...

– کابرا چوارشانە قەد باریکە باڵابەرزەکە ناوی ئامانج بوو.

ماڵەکەمان لەدۆڵێکدا بوو. دیوارەکانی لەبەرد و قوڕ بوون و سەری بە ئاڵوداری لێرەوارەکان داپۆشرابوو. لەگەڵ ئامانج لەسەرپشت رادەکشاین و ئاڵودارەکانی بۆ دەژمـاردم. من وێـڕای ئـەو، هەتا تـەواو دەبـوون، دەمژماردن. بەڵام کاتێک بەتەنیا دەمژماردن، نەمدەزانی لە ژمارە ١٠ی تێپەڕێنم. بە یارمەتیی ئامانج تەواوی ئاڵودارەکانم دەژماردن. لە ژمارەی دەشم تێدەپەڕاند. هێندێکجاریش لەبەر خشەی خشۆکێک لەنێو هەلاشی سەر ئاڵودارەکان، دەترسام و خەوم دەزڕی. ئامانج دەیگوت، ئەوە هیچ نییە، مشکە لەوێ ڕاوڕاوێنیەتی. ئەوکاتە دایە مەرجان دەهاتە لامان و تا خەو دەیبردمەوە حەقایەتی زەماوەندی مشکانی بۆ دەگوتم.

– بۆ ئەفسانە تۆ لە تەلەفزیۆنەوە سەیری کارتۆنی قوتابخانەی مشکانت نەدەکرد؟

– تەلەفزیۆنمان نەبوو.

– بۆچی؟ پارەتان نەبوو؟

– نازانم پارەمان هەبوو یان نا، بـەڵام لـەوێ ئەوکات تەلەفزیۆن زۆر کەمبوو. ئێمە ماڵمان لە دۆڵێکی قووڵدا بوو. لەوێ هیچ کەناڵێکی تەلەفزیۆن وەرنەدەگیرا. بەرقیشمان نەبوو. ماوەیەک شەوانە بۆ چەند سەعاتێک لە ماتۆڕێکەوە بەرقیان پێدەداین.

– بۆ نەتدەزانی پارەتان هەیە یان نا؟ ئەدی ڕۆژانە لە دووکان شتت نەدەکڕی؟

– ئەوێ هیچ دووکان و شتی وای لێنەبوو، شتی لێبکڕین. تۆ ناوی قەندیلت بیستووە؟



– قەندیل؟ بەڵێ، لە تەبریز لە زستاناندا بە هۆی سارد و سەرما، لە گوێسوانەی ماڵەکان قەندیلی سەهۆڵ دروست دەبوون. لە تەبریز هەمیشە بەفر زۆر دەبارێت، شارێکی ساردە. ڕۆژانی زستان ئەگەر هەوا گەرم دەبوو، بەفری سەربانەکان دەتوایەوە و بە پلوسکی ماڵەکاندا دەڕژایە خوارەوە. شەوانە وەختێک سەرماکە زیاتر دەبوو، ئەو ئاوەی بە پلوسکەکاندا دەهاتەخوار، دەیبەست و دەبوو بە قەندیلە سەهۆڵ، مەگەر تۆش هەر ئەوە ناڵێی؟

– نا، قەندیل کێوێکی بەرزە لە کوردستان. لە جوغرافیادا نەتدیوە؟

– من کێوەکانی ئەلبورز و زاگرۆس و قوللەی دەماوەندم لە کتێبی جوغرافیادا دیتووە. بۆخۆشم چەند جار بۆ کوهنەوەردی چوومەتە سەهەند و سەبەلان. وەبزانم چاوم بە قەندیلیش کەوتووە، لە کتێبی جوغرافیادا.

– قەندیل کێوێکی بەرزە لە نێو زنجیرە چیاکانی زاگرۆس دایە و کەوتووەتە سـەر سنووری دەستکردی نێوان کوردستانی ئێران و ئێراقەوە و لە تورکیاش نزیکە.

– ئەفسانە، لەو کاتەوە هاتوومەتەوە ئێرە، ئەوە چەندین جارە لە زمانی زۆر کەسەوە ئەم سنووری دەستکردە دەبیسم. ئەرێ مەبەستتان چییە؟

– سنووری دەستکرد زۆرن. لێرە بەو سنوورانە دەڵێن کە دەوڵەتەکان لە نێوان کوردستاندا دروستیان کردووە. پێشان پارچەکانی کوردستان پێکەوە بوونە و دواتر حکومەتەکان لە نێوان خۆیاندا دابەشیان کردووە.

– ئەهاااا، لەبەر ئەوەیە ئاغام و ئەوانیش بۆ مـەرزی نێوان وڵاتی ئازەربایجان و ئازەربایجانی ئێران هەر ئەم ناوەیان دەگوت. ئەوانیش دەیانگوت ئەم مەرزانە مەسنووعین.

– لەبیرت بێت، جارێکی دیکە بە وردی باسی سنوورە دەستکردەکان دەکەین.

– باشە ئەدی بۆ باسی قەندیلت کرد؟

– ئەم قەندیلەی من باسی دەکەم، کێوێکی زۆر بەرزە و چەندین کێوی بچووکی دیکەی بەسەرەوەیە. پڕە لە ڕەوەز و کەڤر و خڕ و شیوی زۆر ئەستەم. دەوڵەتانی ئێران و ئێراق تا ئێستاش بە تەواوی نەیانتوانیوە داگیری بکەن. تەنیا بە فڕۆکە و تۆپباران هێرشی دەکەنە سەر. ئەم کێوە هەمیشە جێگەی مانەوەی خەباتگێڕانی ئەمدیو و ئەودیوی کوردستانی ئێران و ئێراق بووە. کوردەکان کاتێک لەلایەن حکوومەتەکانی ئەم دوو وڵاتەوە هێرشیان کرابێتە سەر، پەنایان بۆ ئەم چیایانە بردووە. ئێمە ئەوکات ماڵمان لە قەندیل بوو. ئامانج لەگەڵ هاوڕێکانی دژی ئێران لەشەڕدابوون. ئەوەی تۆ پێی دەڵێی، زیددی ئینقلاب. من کچی زیددی ئینقلابم.

– ئەفسانە، ناوێرم چیدیکە سوئالت لێبکەم. من لێرە زۆر ناشیانە قسە دەکەم. لەمەودوا دەبێ هەر خۆت ئەوەندەی بە پێویستی دەزانی، شتەکانم بۆ بگێڕیەوە. داستانی ژیانی تۆ زۆر شیرینە. خۆزگەم بەخۆت کە سەردەمی منداڵیی خۆت ئەوا بەتەواوی لەبیرە. خۆزگەم بەخۆت دایک و باوکت فێری وشەی کوردیان کردوویە و بە حەقایەتی خۆش خەواندوویانی. خۆ تۆ ڕەزای نازانم کێئۆغلوونی، بەردەوام بەدوای رابردووی ونی خۆتدا بگەڕێی. من هەتا لە تەبریز بووم، پێیان دەگوتم، ڕەزا بیژی. ئێستاش لێرە خەریکن ناوی ڕەزا عەجەمم بەسەردا دەبڕن.

– ڕەزا، ئەرێ هەر بەتەمابووم لێتبپرسم «بولۆتئۆغلوو» یانی چی؟ ئەم ناسناوە زۆر لەسەرزاران خۆشە، بەڵام ماناکەی نازانم.

– بولۆت یانی هەور و ئۆغلووش یانی منداڵ. بولۆتئۆغلوو یانی منداڵی هەور. خۆشە؟

– دەی باشە. ڕەنگە هەر منداڵی هەوربی، بۆیە دایک و باوکت دیار نین. دڵی من خەبەر دەدات تۆ بیژوو نی. ئەگەر بولۆتئۆغلووبی، لە



مرۆڤەوە لەدایک نەبوویە. تۆ منداڵی هەوری. تۆ بارانی و بەسەر ئەم زەمینەدا باریوی.

– پێم خۆش بوو تەنیا بەسەر تۆدا بارییام.

– بێتامی ها! زۆر زیرەکی هەمیشە دەرفەتەکان دەقۆزیەوە.

– باشە دەی، ئێوە عادەتتان وایە. هەوڵدەدەن لە بەرانبەر ناسکترین وشە و ڕستەکانیشدا نەرم نەبن و بە ڕەقی وەڵام دەدەنەوە. ڕەنگە لە دڵی خۆتاندا هیچ واش نەبن.

– من هیچ وانیم. ناشتوانم لێت بشارمەوە خۆشم دەوێی. ئەگەر وانەبا، ئەوەندە لێت نزیک نەدەبوومەوە.

لەوکاتانەدا، پێم خۆشبوو زیاتر وەک دوو دڵدار باسی خۆشەویستی بکەین. پێشم خۆش نەبوو درێژەی گێڕانەوەی ژیانی سەردەمی منداڵیت نەبیسم. دەمزانی ئەوەندە تێکەڵین، خۆشەویستییەکە هەر بەردەوام دەبێت، بۆیە پێم خۆشبوو زیاتر لەگەڵ ژیانی رابردووت ئاشنا بم.

– باشە، تۆ لەو قەندیلە ژیاوی؟

– بەڵێ، لە سەرەتای لەدایک بوونمەوە تا تەمەنی ٩ساڵی لە قەندیل بووم. لەوێ بوومە شەش ساڵان و چوومە مەدرەسە. چوومە قوتابخانەی شۆڕش. لە نێو ئەم چیاو چۆڵانەدا منداڵان لە ژوورێکی لە بەردوقوڕ دروستکراودا کۆ دەبووینەوە و تاقە مامۆستایەک هەموو وانەکانی پێدەگوتین. دەرسەکانمان بە فارسی و بە کوردی بوون. دواتر من زانیم ئەوکاتیش لە ئێران کوردی نووسین کارێکی بە مەترسی بووە. لە قوتابخانەکانی وڵات نەک هەر نەیاندەهێشت کوردی بخوێندرێت، زۆر جار ئیزنیان نەدەدا مامۆستاکان و قوتابیان بەکوردی قسەش بکەن. ئێمە کۆمەڵێک کچ و کوڕ لە قوتابخانەکەی قەندیل لەبەردەستی مامۆستایەک دەمانخوێند. هەمیشە بە کوردی قسەمان دەکرد. وانەکانی زانست و بیرکاریمان بە فارسی دەخوێند. کتێبی زمانی فارسیشمان دەخوێند.

بەشی پەروەردەی شۆڕش، کتێبی کوردیشی چاپ کردبوو. ئەویشمان دەخوێند. من ئەوکاتانەی ئامانج دەهاتەوەماڵ، شەوانە لەتەنیشتی رادەکشام و پرسیاری وشەی کوردیم لێدەکرد و دایە مەرجانیش بە حەقایەتە خۆشەکانی دەخەوی دەکردم. لە قوتابخانەکەی قەندیل بوو ماموستا فێری ئەلفوبێ و شیعر و چیرۆکی کوردی کردم. ئەم پیت و وشە و رستانەی لە قەندیل فێریان بووم، وایان لێکردم لە تەمەنی دواتـردا خۆم وردە وردە بـەدوای خوێندنەوەی کتێب و ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردیدا بکەوم و ئەم کتێبخانەیەش پێکەوە بنێم. قوتابخانەکەی قەندیل هەرگیز لە یادم ناچێتەوە. زۆرجار دەنگی تەیارە یان گرمەی تۆپان ئارامیی ئەم چیایانەیان دەشێواند. مامۆستاکەمان پێش ئێمە هەستی بە هاتنی تەیارە دەکرد. دوای ئەوەی مامۆستا دەیگوت، هەڵێن بۆ کونەتەیارە، قرمژنی چەکی زیددی هەوایی پێشمەرگەکانیش دڵی دادەخورپاندین. دایە مەرجان هەموو بەیانیان دەیگوت، کچی خۆم ئەگەر تەیارە هات، زوو هەڵێ بۆ کونەتەیارە. لە نزیک قوتابخانەکەمان پێشمەرگەکان ژێر بەردێکی گەورەیان هەڵکۆڵیبوو. کاتێک تەیارە دەهات، هەموومان دەچووینە نێوی. مامۆستا بەغیرەت بوو. جاری وابوو خۆی نەدەهاتە ژوورەوە. هێندێک جار تەیارە دەهات، شاخەکانی بۆمباران دەکرد و هێندێک جاریش ماڵەکانی ئێمە و دەوروبەریان تۆپباران دەکرد. من ئەوەندەی لە تۆپباران دەترسام، ئەوەندە ترسم لە تەیارە نەبوو. ئەگەر تەیارە هاتبا هەم مامۆستا زوو ئاگاداری دەکردینەوە و هەم دۆشکەی پێشمەرگەکانیش لەسەر شاخەکانی سـەرەوەی ماڵەکانەوە تەقەیان دەکرد. بەڵام ئەگەر تۆپیان هاویشتبا، هەتا گوللە تۆپەکە نەتەقیبا نەماندەزانی. من خوێندن و نووسینی کوردی لەژێر هاڕەی فڕۆکە و گرمەی تۆپەکاندا فێربووم، بۆیە ئەوەندە خۆشم دەوێت.

* * *



گژەباکە دەڵێی تیخی ریشتاشینە. لەبەر تەوژمی بایەکە، ئاوی چاوم دێتەخوار. هەستدەکەم سەرماکە بە برژانگمەوە دەیکات بە سەهۆڵ. دەست لە دەستەوانەکەم دەردێنم و بە ئەنگوست برژانگم پاک دەکەمەوە. قەندیلە سەهۆڵەکانی سواندەی یەکەم کۆڵانی تەنیشت مەیدانی مەقسوودیە نووکیان بەرەو زەوییە. نووکی تیژ و باریکیان هەڕەشە لە ریبوارانی بەر سەرمای بن دیوارەکان دەکەن. ئەوەندەی لە هەڕەشەی قەندیلە سەهۆڵەکان دەترسم ئەوەندە زیاتریش بەپەلەم پێش ئەوەی ئەفسانە خۆی بە دەرگا تەسکەکەی تەنیشت دووکانی مەش بایرامدا بکاتەوە، بیگەمێ. ئەمڕۆ بەم سەرمایە ڕەنگە تەنیا من بزانم ئەوەی خۆی لەم پاڵتۆ ڕەشە کوڵکنە فشە وەرپێچاوە، ئەفسانەیە. ئەفسانە هەناسەیەکی قووڵ هەڵدەکێشێت. ڕەنگە هەستی کردبێت من لێرە نەماوم. بێدەنگە.

ئا ئا، دەبێ هەستی بەوە کردبێت لێرە نەماوم، بەڵام وەسەرخۆی ناهێنێت. نا، ئەفسانە ئێستا گەڕامەوە. خەریکم بەراوردی نێوان قەندیلەکانی تەورێز و قەندیلی تۆ دەکەم. ئەو وردە قەندیلانەی تەورێز هەڕەشەبوون و زۆرجار بەسەر خەڵکدا دەکەوتن، بەڵام قەندیلەکەی تۆ کەسانی ئازا و بوێر لەباوەش دەگرێت. بە ئاگری بۆمبا و گوللەتۆپ دەسووتێت، بەڵام ئێوە بە قوتابخانەکەتانەوە لە باوەش دەگرێت. قەندیلەکەی من سەری لەزەوییە و هەڕەشە لە ریبوارانی سەر شۆستە و پیادەڕۆکان دەکات و قەندیلی تۆ سەری بەرەو بەرزاییە و دەبێتە خانەخوێی ئەو کەسانەی تێیرادەبینن و پشتی پێدەبەستن.

– ئاخری لەگەڵ ئامانج، قەندیلتان بەجێ هێشت؟

– نا، پێکەوە نەهاتینەوە، ئەو بەرلەئێمە هاتەوە.

ئەمجارە وێدەچێت، تۆ لە پرسیارەکانی من دابڕابی. خەتای خۆت بـوو. خـۆت گوتت مـن تینووی پرسیار کـردنم. پرسـیارم لێبکە تا وەڵامت بدەمەوە. هەست دەکەم پرسیارکردن لەتۆ، نەترسان و ورەی

پێویستە. لەلایەک گرفتاری دڵنیگەرانی و دامان و خەمخواردنی تۆم و لەلایەکیدیکەوە پرسیاری زیاتر لە مێشکمدا ریز دەبن. چۆن وەڵامیان بۆ بدۆزمەوە؟ تاقەتم لێبڕاوە. ناتوانم ئەوەندە چاوەڕوان بم. تۆ لەجیات ئەوەی وەڵامی پرسیارەکانم بدەیەوە، بەدەروونی خۆتدا رۆدەچییەوە. ئێستا بیر لەکام بیرەوەریی خۆشی خۆت و ئامانج دەکەیەوە؟ هەر بە پرسیارەکانی من وات لێدێت یان هەموو رۆژێک ئەوەندەی چاوت بە وێنەی ژێر تۆڕە تەنکەکە دەکەوێت، تووشی ئەم حاڵەتە دەبی؟ ئەگەر وابێ، زۆرم پێسەیرە تا ئێستا تابت هێناوە.

سەیرە ئەفسانە، سەیرە، هەموو رۆژێ چەندجار چاو لە وێنەیەک بکەی کە تەنیا تۆڕێکی تەنک لەتۆی دابڕاندبێت. چۆن ئەو تۆڕە پێش بە ئەسپی خەیاڵت دەگرێت و رۆژانە چەندین جار ناتباتەوە باوەشی ئامانج و ریزێک وشەی تازەت فێر ناکات؟ چۆنە حەقایەتەکانی دایە مەرجانت نایەنێتەوە یاد کە ئامانجی دەکردە قارەمانی هەموویان؟ چۆنە رۆژێ چەندجار گرمەی تۆپ و هاشەی تەیارە راتناچڵەکێنێت؟

هەموو ئەو حەقایەتانەی دایە مەرجان بۆ تۆی دەگێڕایەوە، ئامانج قارەمانیان بوو. ئامانج تەنیا کەسایەتیی نێو چیرۆکەکانی دایە مەرجان بوو کە دەیتوانی لەهەموو رووداوەکاندا جڵەوی رێنوێنیی هاوڕێکانی بەدەستییەوە بگرێت. ئامانجی ناو حەقایەتەکانی دایە مەرجان، وەستای لێهاتووی هەموو بوارەکانی ژیان بوو. چۆنە ئەفسانە؟ چۆنە لەو حاڵەتەدا دەتوانی گوێ لە پرسیارەکانی من بگری؟ ئەی خۆت نەتگوت، هەرچی پرسیارم لێبکەی، زیاتر تینووی وەڵامدانەوە دەبم؟ کوا، ئەدی بۆ بێدەنگ بووی؟ لەمەودوا نە پرسیاری قەندیلت لێدەکەم و نە وادەکەم ئامانجت بێنمەوە یاد. ئەدی چیت لێبپرسم؟ خۆ ناکرێ دوای گێڕانەوەی ئەم بەسەرهاتە تاڵە، یەکسەر باسی ئەوینداری بکەم. ئەها، دیتمەوە، سنووری دەستکرد!



– ئەفسانە، تۆ گوتت سنووری دەستکرد زۆرن، نەمزانی مەبەستت چییە؟

– سنوورە دەستکردەکان هەر ئەوانە نین ئێمە بەچاو دەیانبینین. زۆر کەس باس لەم سنوورە دەستکردانە دەکەن کە دەستەڵاتەکانی زاڵ ئێمەیان پێ پارچەپارچە کردووە. من ئەم سنوورانە هەر بە سنوور نازانم. خۆشەویستی و حەزی یەکترویستن ئەم سنوورانە پاکدەکاتەوە یان دەیانبەزێنێت. کاتێک پارچە لێکدابڕێنراوەکان دەگەنەوە یەک، ئەم سنوورانە خێرا لە یاد دەچنەوە. ئەم سنوورە دەستکردانەی من دەیانڵێم، دەستکردی بێگانە نین. دەستکردی خۆمانن. خۆمان هێندێک سنوورمان دروستکردوون بێئەوەی هەستیان پێبکەین، بەدەستیانەوە دەناڵێنین. ئەم سنوورانەن برینی قووڵ دەخەنە جەستەمان و ئەم برینانە بە زەحمەت سارێژ دەبنەوە. برینی ئەم سنوورانە ئەوکاتەی زۆر قووڵ دەبنەوە، وەرهەم هەڵدێنن و دەبنە خەرەندێکی قووڵ و هەڵدێرگەی هەموومان. ئێمە لە قۆرت و خەرەندی قووڵی ئەم سنوورانە دەکەوین و پێیاندا رۆدەچینە خوار. وەک زەلکاوێکن هەتا خۆمانی بۆ بلەقێنین، زیاتر رۆدەچین. ئەم سنوورانە هەڕەشەی لەنێوچوونمان لێدەکەن.کێشەکە لێرەدایە، زۆربەمان هەست بەئەم سنوورە دەستکردانەی دەستی خۆمان ناکەین و پێشیان نازانین. هەر لێرە لە نێوان من و تۆدا سنوورێکی دەستکردی خۆمان هەیە. من ژنم و تۆ پیاوی. سنوورێکی قووڵ لە نێوان ژن و پیاودا هەیە. بەشێکی زۆری ئەم سنوورە بەدەستی خۆمان رۆنراوە. دەستکردی خۆمانە. ئەگەر من و تۆ بەر لە هەموو شتێک بەم ئاکامە بگەین هەردووکمان مرۆڤی بەرابەرین، ئیدی ئەم سنوورە نامێنێت.

– من لەنێوان خۆم و خۆتدا هەست بە هیچ سنوورێکی دەستکرد ناکەم. ئەوەی لە نێوانماندا هەیە، سنووری تەبیعییە. تۆ لە من شارەزاتر و

تێگەیشتووتری و من لەتۆ کەمتر ئاگادارم و کەمتر دەزانم. ئەوە سنوورێکی تەبیعییە  و بە هۆی ئەم تەفاوتەی بەینی من و تۆ دروست بووە.

– من ئـەوا نالێم. من پێموایە ئـەوەی تۆ باسی دەکـەی سنووری دەستکردی خۆمانە و سنوورێکی قووڵ لە نێوان نێر ومێدا هەیە. تۆ واز لەوە بێنە، باش بوو باسی سنووری سروشتیت کرد. سنوورەکان دوو جۆرن. سنووری سروشتی و سنووری دەستکرد. بۆ نموونە، سنووری نێوان دەریا و وشکانی سنووری سروشتین، سنوورەکانی نێوان قارە لە یەکتردابڕاوەکانی جیهان سنووری سروشتین. سنووری نێوان وەرزەکانی ساڵ سروشتین. سنووری نێوان نێر ومێش سروشتین. سنووری نێوان مافی زۆری پیاوان ومافی کەمی ژنان سنووری دەستکردن. سنووردارکردنی ئازادییەکانی مرۆڤ سنووری دەستکردن و بە هۆی ئەو یاسایانەوە دیاریکراون کە بە دەستی مرۆڤ دارێژراون. من ئەوسنوورە دەستکردانەشم پێ سەیر و سەمەرە نین. ئەم سنوورە دەستکردانە بە خواست و بە ئاگاداری و بیرلێکردنەوە دروست کراون. بەڵام هێندێک سنوور مەترسیدارن کە خۆمان بێ‌ئەوەی بیری لێبکەینەوە بەزیانی خۆمان دروستیان دەکەین. زۆر جار سنووری سروشتی، دەستکاری دەکەین و تا ئاستی سنووری دەستکرد خرایان دەکەین. بۆ نموونە، ئەوە شتێکی زۆر سروشتییە ئەندامانی کۆمەڵگایەک بیروڕای جیاوازیان هەبێت. سنووری نێوان جیاوازیی ئەم بیروبۆچوونانە زۆر سروشتییە و ئەگەر مرۆڤەکان خاوەنی بیری جیاواز نەبن، هەر جووڵە و پێشکەوتنیش نامێنێت. پێشکەوتن و فێربوون و جووڵە لە جیاوازیی بۆچوون و بیرکردنەوەکانەوە دەکەوێتەوە. بەڵام کاتێک مرۆڤەکان لە نێوان جیاوازییەکاندا سنوورێکی وا هەڵدەبەستن کە پەیوەندییەکان بە تەواوی بپچڕێن و دابڕان و نێوان ناخۆشی و توندی و تیژیی لێبکەوێتەوە، ئەوکاتەیە سنوورە سروشتیەکان دەبن بە سنووری دەستکرد. کاتێک بە



هۆی جیاوازیی بیروبۆچوون یان جیاوازی لە تێگەیشتنمان، سنوور دەخەینە نێوان خۆمانەوە، ئەوە سنوورێکی دەستکردی مەترسیدارە. یان جیاوازیی قەوم و تیرە و عەشیرەت و حیزبەکان و شێوە ئاخاوتنەکانی زمانی خۆمان ئەوەندە زەق دەکەینەوە کە دەبێتە هۆی لە یەکتر دابڕانی گۆمەڵگە و لێکترازانی لێدەکەوێتەوە. ئەوکاتە سنووری دەستکردی مەترسیدارمان دروست کردووە. کاتێک سنووری سروشتیی نێوان نێر و مێ ئەوەندە بەرز بکەینەوە کە ژن و پیاو بەیەکجاری لە بواری کارکردن و فێربوون و دەرفەتەکانەوە لێک دابڕێن، ئەوە ئەوکات ئەم سنوورە سروشتییەمان تێپەڕاندووە و کردوومانەتە سنوورێکی دەستکردی مەترسیدار.

– ئەفسانە، من هەر بە هۆی ئەم بۆچوونەی خۆتەوە هەست بە بوونی سنووری نێوان خۆم و خۆت دەکەم. ئەو زانیارییانەی تۆ هەتە و من لێیان بێبەشم، سنوورێکی قووڵیان لە نێوان من و تۆدا دروست کردووە. دەکرێ زیاتر یارمەتیم بدەی و ئەم سنوورە نەمێنێت یان کەمتر بێتەوە؟

– هەر وەک گوتم، ئەم سنوورەی لە نێوان خۆم و خۆتدا هەستی پێدەکەی، سنوورێکی دەستکردە. سنووری سروشتی قەت بە مرۆڤ کاڵ نابێتەوە. ئەوەتا تۆ پیاوی و من ژنم. هەرگیز دەم و چاوی من وەک هی تۆ مووی لێناڕوێت و من وەک تۆ نابم بە خاوەنی ریش و سمێڵ. تۆش قەت نابی بە خاوەنی سینەیەکی ژنانە و ناتوانی منداڵت ببێت و شیری خۆتی پێبدەی. ئەوە سنووری سروشتیی نێوان من و تۆیە. بەڵام ئەوەی تۆ باست کرد، سنووری دەستکردە. تۆش دەتوانی ئەوی من دەیزانم، بە خوێندنەوە و خۆماندووکردن فێری بی. دەکرێ من و تۆ بە هۆی گۆڕینەوەی ئەزموونەکانمان و لێکتێگەیشتن، بەشی دەستکردی سنوورەکە لەنێو بەرین، بەڵام سنووری سروشتی هیچی لەگەڵدا ناکرێت.

لێرە ویستم دەرفەت بقۆزمەوە و باسەکە بە لایەکی دیکەدا بەرم. بۆیە گوتم:

– من بەزاندنی سنوورە سروشتییەکەی تۆم پێ ئاسانترە. من و تۆ وەک خۆت دەڵێی، دەتوانین زیاتر تێکەڵ بین. ئەوەندە لەیەکتر نزیک ببینەوە، تۆزقاڵێک سنوور و مەودا لە نێوان خۆماندا نەهێڵین.

– دەزانی هەر تۆ وانی و هەموو پیاوەکان وا بیردەکەنەوە؟ هەمیشە بەزاندنی ئەم سنوورە ختوکەی مێشکی هەمووتان دەدات. ئەوەی ئێوە بیری لێدەکەنەوە، سنووربەزاندنە نەک سنوور لابردن. ئەوە دەستدرێژییە.

– دەی باشە ئەگەر بە قسەی تۆ بێت دەبێ ژن و پیاو هەمیشە لە یەکتر دوور بکەونەوە.

– نا، مەبەستی من ئەوەیە، ئەم سنوورە سروشتییەی لە نێوان ژن و پیاودا هەیە، نابێ بە زۆری ببەزێندرێت. ئەودەم دەبێتە دەستدرێژی. تەنیا خۆشەویستی دەتوانێت ئەم دوو بوونەوەرە لێک نزیک بکاتەوە و بە خواستی خۆیان تێکەڵ بن. ئەم تێکەڵبوونەش زۆرجار کاتییە. دوای ئەم ماوە کاتییە، سنوورەکە هەر لە جێگەی خۆیەتی. ئامانج بە جوانی هەستی بە تایبەتمەندیی ئەم سنوورە کردبوو. دواتر ئەگەر گەورە بووم، تێگەیشتم من و ئامانج کە باوک و کچ بووین، پێویستمان بە بەزاندنی سنووری سروشتیی نێوان ژن و پیاو نەبوو، بەڵام ئامانج نەیهێشت سنووری دەستکرد لە نێوان من و خۆیدا دروست بێت. هەر ئەوەش وایکرد دوای مردنیشی، تەنیا بە هۆی تۆڕێکی تەنکەوە مەودا بخەمە نێوان خۆم و ئامانجەوە.

– خۆت هاتیەوە سەر ئامانج. من حەزم دەکرد ئامانجت لەبیر بچێتەوە. تۆ دوای ئەوەی باسی ئامانجت کرد، لەمن دابڕای و بە خەیاڵتدا ڕۆچوویەوە.

– من پێم گوتی، هەمیشە و لە هەموو کاتێکدا ئامانجم لەبیرە. کاتێک



باسی شتی لاوەکیش دەکەم، ئامانجم لەگەڵدایە و لێم دانابڕێت. تۆزقاڵێک لەوە مەترسە من ئامانجم دێتەوە یاد. هەتا ئەوڕۆژەی دەبم بە خۆڵەپۆت بیر لە ئامانج دەکەمەوە.

– لێرەدایە من ئێرەییت پێدەبەم. باشە تۆ ئامانجێکت هەیە، بیری لێدەکەیەوە. من هەروا دەگەڕێم و ئامانجی خۆم نادۆزمەوە. تێیدا ماومەتەوە. دوای هاتنم بۆ ئێرە، ناوی ڕەزا بیژووم لەسەر هەڵگیرا. تۆ بڵێی، سەرەداوێک لە رابردووی خۆم بدۆزمەوە یان بۆ هەمیشە ناوی ڕەزا عەجەمم بەسەردا دەبڕێت؟

ئەو کاتەی بە یەکجاری هاتمەوە ئەم شارە و لە مەدرەسە دەستبەکار بووم. لەبەر لەهجەی قسەکردنم، منداڵان ناویان نام موعەلیمە عەجەمەکە. پاشان لەنێو موعەلیم و قوتابییەکاندا ناوی ڕەزا عەجەمم بەسەردا بڕا. سەرەتا ڕەزا عەجەمەکەم زۆر پێ لە ڕەزا بیژوو باشتر بوو. ئێستا کە لە بارودۆخی ئێرە گەیشتووم، وردە وردە رقم لەم پاشناوەشم دەبێتەوە. لەبیرتە ئەو چەند مانگەی سەرەتای هاتنم بۆ ئێرە، چەندە لەژوورێدا دانیشتم. بە ڕۆژ و بەشەو خەریکی خوێندنەوە و فێربوونی زمانی کوردی بووم. ئەوەندەم حەز لێبوو وەک تۆ، بەم جوانی و ڕەوانیە قسە بکەم، بابەتی شکایەتەکەشم لەبیرکرد.

– تۆ ئەوەندە خێرا فێری زمان بووی، منیش سەرم لێ سوڕماوە. جاری وایە وشەکان لەمنیش باشتر لە جێگەی خۆیاندا دەگونجێنی. من نەپێت دەڵێم بیژوو نە پێت دەڵێم عەجەم. بولوتئۆغلوو ناوێکی پڕ بە پێستی تۆیە. تۆ کوڕی هەوری. پێموایە ڕۆژێک دادێت تۆش وەک من ئامانجی خۆت بدۆزیەوە و لەم دڵەڕاوکێیە رزگار بی. سەبرت هەبێ. وەک دایە مەرجان دەڵێت، هەرکەس لەسەر سەبرانە، لەسەر خێرانە.

❊ ❊ ❊

تەهمینە بە تەنیشت بەردێکدا ڕۆیشت. ئەو کەوتە ئەودیو بەردەکە

و بۆ ماوەیەکی کورت لەوێ وەستا. سەرنجم کەوتە سەر بەردەکە. لە پشتبێند بەرەوژێری لەشی تەهمینەی لێونکردم. بەردەکە دەتگوت منداڵێکی بێدەرەتانە لە قەدپاڵی ئەم کێوە سەری بەرەو پشتەوەی بەرز کردوەتەوە و هەردوو دەستی ناوەتە سەر ئەژنۆکانی و بەزۆر دەیهەوێ هەنگاو باوێت وهەر دووک پێی بە تاشەبەردێکی پانی رێکی عەردەکەوە نووساون. دەیهەوێ هەنگاو باوێت و پێیەکانی بۆ لە تاشەبەردەکە جیانابنەوە. بەردەکە و تەهمینە و چیاکە لەبەرچاومدا لێڵ دەبن. ئاغام هەموو منداڵەکان بێدەنگ دەکات. تەختەڕەشەکە پاک دەکاتەوە. ئاغام لە وێنەکێشاندا شارەزایە. لەسەر تەختەڕەشەکە دەست بە کێشانەوەی وێنەیەک دەکات. ئاوڕێک وە تەنیشت خۆم دەدەمەوە. بەسەر قوتابییەکاندا سەرنجم دەکەوێتە سەر دیواری بە قوڕ و کا سواغدراوی پۆلەکە. زەرگەتەیەک لە نێوان جەمسەری ئاڵوودارێک و دیوارە کاگڵەکەدا خۆی بە هێلانەکەیدا دەکات. هێلانەکە دەڵێی لەتێکی بچووکی شانەی بێهەنگوینی هەنگە و بە داوێکی باریکەوە بە کۆتایی ئاڵوودارەکەیانەوە بەستووەتەوە. لەگەڵ دەنگی ئاغام وەخۆ دێمەوە. لە سەرووی تەختەڕەشەکە سەرنجم دەکەوێتە سەر شاهەنشا و شابانوو و کوڕەکەی و بەرەو وێنەی سەر تەختەڕەشەکە دەگەڕێمەوە.

– بەچێها ئین عەکسو میشناسید؟[1]

هاوپۆلەکانی نێو ژوورەکە بە یەکەوە دەڵێین:

– هانس کریستیەن ئەندرسن دوستێ بۆزۆرگێ بەچێها.[2]

ئاغام بەدرێژی باسی بەرهەم و ژیان و شوێنی لەدایکبوون و ناشتنی هانسکریستیەن ئەندرسنی بۆ کردبووین. ئاواتم دەخواست ڕۆژێک دابێت گەورەبم و وەک هانس کریستیەن ئەندرسن چیرۆک بۆ منداڵان

١– منداڵینە، ئەم وێنەیە دەناسن؟
٢– هانس کریستیەن ئەندرسن، دۆستی گەورەی منداڵان.



بنووسم. من خۆم داوام لە ئاغام کردبوو، بەرلەوەی دەرسمان بگاتە ئەم وانەیە، یەک دووجار بۆم بخوێنێتەوە. هەمووی خەتای ئاغام بوو، پێموابێ وانەکە لە کتێبی ئەمساڵیشماندا نەبوو، بەڵام دیاربوو خۆی حەزی لێبوو بیزانین. وەبزانم ئەم وانەیە هەر لە کتێبی ئەوساڵی ئێمەشدا نەبوو، ئاغام هەر خۆی باسی ئەم نووسەرەی بۆ کردبووین.

شەرمم دەکرد لە ئاغام بپرسم ئەم پارچە قوماشە چییە لە ملی هانس کریستیەن ئەندرسنت کردووە، بەڵام دواترێ لە تەورێز کاتێک مامان بۆ میوانداری و شاییەکان سازی دەکردم، زۆرجار پاپیۆنێکی جوانی دەخستە ملمەوە. هەمووجارێک لەو کاتانەدا هانس کریستیەن ئەندرسنم دەهاتەوە یاد و خۆم لەجێگەی ئەو دادەنا.

ئەفسانە، دەترسم تۆش وەک پەری دەریاییەکەی هانس کریستیەن ئەندرسن، فەرامۆشت کردبێ مرۆڤ لەنێو دەریادا هەناسەی بەند دەبێت و دەخنکێت. دەترسم منت ڕاکێشابێتە نێو دەریای ئەفسانەکان و لەوێدا لەهەناسە بکەوم و بخنکێم. ئەوکات ناچارم لێت ببوورم. ئەوە نییە تۆ لە خۆشەویستییان راتکێشاومەتە نێو دەریای بێسنووری ئەفسانەوە؟

– ئەوە چۆنبوو تۆ باسی هانس کریستیەن ئەندرسنت کرد؟ ئاغام دەیگوت، هانس کریستیەن ئەندرسن لە باغێکی شاری کۆپنهاگن نێژراوە. تۆش دەڵێی، فەرمانده قژ ماشوبرنجیەکەی ئامانجیش هەر لەم باغە نێژراوە.

– ئەی من نەمگوت، هەمیشە و لە هەموو کاتێکدا ئامانجم لەبیرە؟ زۆرجار لەم کاتەی ئێستا دەردەچم و دەگەڕێمەوە نێو ئەو بیرەوەریانەی لەگەڵ ئامانجدا هەمبوون. زۆربەی ئەم بیرەوەریانە دایە مەرجان پێشی بە لەنێوچوونیان گرت. دوای ئامانج، ئەو شتانەی ئامانج بۆی گێڕابوومەوە و لەبیرم نەمابوون، دایە مەرجان هەناسەی قووڵی بۆ هەڵدەکێشا و جارێکیدیکە بۆی دەگێڕامەوە. لەم نێوەدا دایە مەرجان زۆر شتی دیکەی بۆ گێڕامەوە کە ئەوکات ئامانج پێی وابوو نابێ لە

تەمەنی منداڵیدا بۆمنیان بگێڕێتەوە. هێندێکجار کاتێک بەنێو ئەم بیرەوەریانەدا دەگەڕێمەوە، خەیاڵ و بیرکردنەوەکەم دەبێت بە وشە و لە دەمم دەردەچێت. ببوورە ئەمەش یەکێک لەم حاڵەتانە بوو.ڕەنگە تۆش دوای ئەم هەموو چەرمەسەرییە تووشی ئەم حاڵەتە بی.

– بۆ چما ئەفسانە، فەرماندە قژماش‌وبرنجیەکەی ئامانجیش چیرۆکی بۆ منداڵان دەنووسی؟

– نا، بەڵام منداڵی زۆر خۆش دەویست و بەرەو دەریایەک ڕۆیشت کە ئاخری لە نەفەس کەوت و گیانی لەدەست دا. ئەو پێشتریَ ماموستای جوغرافیا بوو. لە مەدرەسەکانی شاری گێلاساوا وانەی جوغرافیای دەگوتەوە. من ئەوکات لەدایک نەبووبووم. ئامانج دەیگوت، ماموستای ئەویش بووە. فەرماندە قژماش‌وبرنجیەکە، وێڕای ماموستایەتی لەگەڵ ئامانج بووە بە برادەریش. دوایی بەیەکەوە ناچار دەبن چەک بکەنە شانیان و شار جێ بهێڵن.

– ئەی چۆن بووە ئەم ماموستایە، ببوورە ئەم فەرماندەیە ڕێی کەوتووەتە باخچەکەی کۆپنهاگن و لە نزیک گۆڕەکەی هانس کریستیەن ئەندرسن نێژراوە؟

– ڕەنگە ئەویش منداڵی زۆر خۆش ویستبێت، بۆیە دراوسێیەتیی هەمیشەیی ئەندرسن بە نەسیبی بووە. ئامانج ئەوکاتانەی لەنێو شار و گوندەکانەوە لە قەندیل دەگەڕایەوە لای ئێمە، کەمتر لای من باسی شەڕ و شتی وای دەکرد. شەوێک وایزانی من خەوتووم. لێم نزیک بۆوە و چرا لامپاکەی هێنایە سەر سەرم. من چاوم لەسەریەک دانان. بەڵام زوو پەشیمان بوومەوە. لەوە ترسام ئامانج بۆ ئەوە لەمن ورد بووەتەوە، دوایی لەگەڵ دایە مەرجان دەستەملانی یەکتر بن، بەڵام وا نەبوو. ئامانج قەت ڕووداوی وای بۆ من نەدەگێڕایەوە، دڵم بریندار بکات یان بۆ هەستی منداڵانەم ناخۆش بێت. بەڵام من هەمیشە حەزم



لەو شتانە بوو کە زیاتر بۆ گەورەکان دەگێڕدرانەوە. ئامانج شەرمی دەکرد لە بەر چاوی من دەستەملانی دایە مەرجان بێت. لە ماوەی ژیانیدا بۆ یەکجاریش بەم شێوەیە نەمدیتن. ئەمجارە ترسام ئامانج لە تاسەی دووریی دایە مەرجاندا پەلە بکات. بەڵام وانەبوو.

ئامانج خۆی لە دایە مەرجان نزیک کردەوە و ئەم بەسەرهاتەی بۆ گێڕایەوە. من ئەوکات بە وردی لە بەسەرهاتەکە تێنەگەیشتم، بەڵام دواتریَ کە گەورە بووم، چەند جاران داوام لە دایە مەرجان کرد و بۆی گێڕامەوە.

ئامانج باسی زیرەکی و لێهاتوویی فەرماندە قژ ماش‌وبرنجییەکەی دەکرد. گوتی:

تازە چەند مانگێک بەسەر شۆڕشەکەی ١٣٥٧دا تێپەڕیبوو. ئێمە لە هێندێک لە شارەکان دەرچووبووین و چەند شارێک و زۆربەی گوندەکانمان بەدەستەوە بوو. پۆلێکمان لە بەرزاییەکانی پشتی گوندی شیوەشوێنی سەروو دامەزرابووین. هێزێکی میلیشیای چەکدار هێرشیان کردە سەر گوندەکە. دانیشتوانی شیوەشوێنی سەروو کورد بوون چەند ماڵێکی ئازەریشی لێبوو. چونکە من برادەرێکی زۆر خۆشەویستم لەو گوندەبوو و هاتوچۆیم دەکرد، هەموو خەڵکی گوندەکەم دەناسی. شیوەشوێنی خوارووش کە دەکەوێتە دەشتاییەکەوە، هەموو دانیشتوانی تورکی ئازەرین. میلیشیاکانیش لە کۆمەڵێک ئازەریی ناتێگەیشتوو و هەلپەرەست پێکهاتبوون کە بە خوێنی تەبایی نێوان ئێمە و ئازەرییەکان تینوویان کردبوون. لەنێو گوندی شیوەشوێنی کوردان گرمە و تەقەی تفەنگان بەرز بۆوە. هێزەکانی ئەوان زۆر بوون و لە لایەن پاشماوەی سوپای ڕژێمی پاشایەتیشەوە پشتیوانی دەکران. ئاگر لە دەوەڵان و کادێن و ماڵەکان بەرز بۆوە و هەموو گوندەکەیان ئاگردا. ئێمەش دەمەو ئێوارە بەرەو گوند شۆڕ بووینەوە و دەورەی گوندەکەمان تەوق کرد. میلیشیاکان گوندەکەیان لەنێو دووکەڵ و بۆنباڕووتدا بەجێهێشت و

بەرەو دەشتایی پاشەکشەیان کرد. تەنیا دەنگی تەقەی چەکێک لەنێو گوند دەهات. بە کەس بەرزەم نەدەکرا. خۆی دەپەسیوان دەگرت و تەقەی لێدەکردین. تەقەکە لە نزیک ماڵی برادەرەکەی منەوە دەهات. بە قوونەبانی ماڵی برادەرەکەمدا سەرکەوتمە سەربانیان و دیتم لە کۆڵانی بەر ماڵیان پیاوێکی زەبەلاحی بەشان و باهۆ دەشیرێنێت. جوێن بە ئێمە دەدات و بێئامانج فیشەک دەتەقێنێت. سێرەم لێگرت و دامە بەر دەستڕێژ و لە خۆڵەمێشەکە گەوزی. خۆم فڕێدایە خوار و چەک و رەخت و فیشەکدانەکەم لێکردەوە وکارتەکەیم لە گیرفانی دەرهێنا. ناسیمەوە. وەک کەسێکی سەرسەری و بێورەی ناوچەکەمان دەناسرا. خۆم بە حەوشەی ماڵی برادەرەکەم داکرد. برادەرەکەم لە نێوەندی حەوشەکەیان کەوتبوو. هەموو لەشی بە گوللە دابێژدابێژ کرابوو. پێش چاوم سوور هەڵگەڕا. گەڕامەوە سەر مەیتی کابرای پێشوو. ڕێزێکی دیکە فیشەکم پێیەوەنا.

گەڕامەوە ماڵی برادەرەکەم و دەرگای ژوورەکەیانم کردەوە. ژنەکەی هەردوو رانی لەبەریەک ئاوەڵا کرابۆوە و بەم شێوەیە قاچ و دەستی بەسترابوو. جلەکانی بە دڕاوی بە ژوورەکەدا بڵاو کرابوونەوە. چاوی بەمن کەوت، چەندی کردی دەستی بۆ ئازاد نەکرا نێوگەڵی خۆی پێداپۆشێت. یەک بەخۆی هاواری کرد: کاک ئامانج بەقوورررربانت بم. بەقوربانی ریزێک فیشەکم کە. زووکە بمکوژە. تازە من بۆ ئەوە نابم لەسەر ئەم دنیایە بژیم. بمکوژە بە قوربانت بم.

زوو خۆم گەیاندە جلەکانی و کراسە دڕاوەکەیم بەسەری دادا و دەست و قاچم کردەوە. خێرا خێرا خۆم بە قوربانی دەکرد و داوام لێ دەکرد سەبری بێت، حەتمەن تۆڵەی دەکەمەوە.

– ناوی ژنەکە چی بوو؟

– ئەوە پرسیاری من و دایە مەرجانیش بوو، نە ئامانج ناوەکانی بە



دایە مەرجان گوت و نە دایە مەرجانیش ناوەکەی دەزانی تا بە منی بڵێت.

– بەڕاستی بەسەرهاتێکی ناخۆشە! ئەی دوایی چۆن تۆڵەیان کردەوە؟

– هەر بۆیە باسی فەرماندە قژ ماشوبرنجییەکەم کرد. ئامانج دەیگێڕاوە: دوای ئەم رووداوە لەژێر گوشاری ئێمەدا فەرماندەکانمان تەمایان گرت، ئێمەش گوندی شیوەشوێنی خواروو ئاگر بدەین. ئێوارە درەنگانێک هێرشمان دەست پێکرد و گوندەکەمان گەمارۆ دا. پیاوەکانیان زووتر پێیان زانیبوو و لەترسان رایانکردبوو. بەشێک لە ژن و منداڵیشیان لەگەڵ خۆیاندا بردبوو. تەنیا ژن و منداڵی چەند ماڵێک لەوێ مابوون. پیاوێکیش بە خۆی و بە کوڕەکەی نەڕۆیشتبوو. ئەو لە ئێمەی رانەدەدیت بیکووژین. پیاوێک بوو هەموو خەڵکی گوندەکانی دەوروبەر بە کورد و ئازەرییەوە ریزیان لێدەگرت. پیاوێکی خوێنشیرین و ئینساندۆست بوو. خەڵکی گوندەکەمان لە نێوەڕاستی ئاوەدانی کۆ کردەوە. نازانم بەکوێدا فەرماندە قژ ماشوبرنجییەکەمان دەرکەوت. ترێلێکی دوای تراکتۆر لە مەیدانچەیەکی نێوەندی گوندەکە راگیرابوو. رۆیشتە سەر ترێلەکە و رووی کردە ژن و منداڵی بەجێماوی ئازەرییەکان و دەستی پێکرد:

– ئێمە ناچار بووین و تەنیا بۆ ئەوەی بڵێین ئێمەش دەتوانین کاری خراپ بکەین و بەڵام لێی دوور دەکەوینەوە، هێرشمان بۆسەر ئەم گوندەی ئێوە هێنا. بەرلەوە چەکدارە میلیشیاکان، دەستدرێژیان کردە سەر شیوەشوێنی سەروو و دەستیان بە کوشتوکوشتار کرد و دەستدرێژیان کردە سەر خەڵک. بەڵام ئێمە هاتووین پێتان بڵێین خوشک و برای یەکترین و ئیزن بەهیچکەس نادەم بە چاوی سووک سەیرتان بکات. تەنیا داواتان لێدەکەم، ئێستا کە لێرە رۆیشتن پەیامی ئاشتیخوازانەی ئێمە بۆ خزم و دۆست و ناسیاوەکانتان بەرن. هەر ئێستا بە تراکتۆرێک ئەم ترێلە رابکێشن، هەمووتان سواری بن و لەبەرچاوی من بە سلامەتی گوندەکە جێ بهێڵن. هیوادارم ئەم منداڵە ڕەنگ زەرد و

ترساوانە، لەوە زیاتر نەترسن و لە داهاتوودا ببن بە ژن و پیاوی ئاشتی و خۆشەویستی.

منداڵە چڵمنەکانی ماچ دەکرد و بەدەستی خۆی سەری دەخستنە سەر تریڵەکە.

ئێمە کە چەکداری ژێر دەستی فەرماندە قژ ماشوبرنجییەکە بووین، سەرەتا پێمان ناخۆش بوو نەیهێشت تۆڵەی گوندی شیوەشوێنی سەروو لە گوندی شیوەشوێنی خواروو بکەینەوە. ژن و منداڵەکانمان بەرەو ناوچەی ژێر دەستەڵاتی میلیشیاکان بەڕێ کرد و چەند کەسێکمان بەدزی فەرماندەکە گوندەکەمان ئاگر دا. بەڵام ئەم ئاکارەی فەرماندەکەمان ئەوی چەند ئەوەندەی دیکە لای ئێمەش خۆشەویستتر کرد. لەگەڕانەوەدا کۆی کردینەوە و بەدرێژی باسی ئاکامی هەڵسوکەوتی جوامێرانەی تێکەڵاو بە لێبوردنی بۆ کردین. گوتی سەبارەت بە ئاگردانی گوندەکەش ناڕەحەتە، بەڵام وێدەچوو ئەوی زۆر پێناخۆش نەبووبێت.

– ئەی ئەم فەرماندە خوێن شیرینە ئێستا لە کوێیە؟

– چەند ساڵ دوای نەمانی ئامانج، ئەویش بۆ کاروباری سیاسیی رووی کردە ئورووپا. بڕیار وابوو بگەڕێتەوە، بەڵام لەوێ هەستی کرد تووشی نەخۆشی هاتووە و دواتر لە شاری کۆپنهاگن چاوی لێکنا و بۆ هەمیشە بوو بە دراوسێی هانسکریستیەن ئەندرسن.

دڵم توندتر لێدەدات. کێ دەڵێ، منیش لە کوێ خاڵی کۆتایی دەکەوێتە سەر چیرۆکی ژیانم و دوور لە ئەفسانە لە کام وڵاتی دووری دوور سەردەنێمەوە. بۆیە دوودڵم و ڕەنگە ئەم سەفەرەم بە نیوەچڵی بمێنێتەوە.

بەرچاوم روون بۆوە. تەهمینە لەپشت بەردەکە هاتە ئەملاوە و بەژێر لەچکەکەیدا دەستێکی بە قژەکانیدا هێنا. دەستی مەودای خستە نێوان بەشێک لە لەچک و مانگی ڕوخساری و ئەو بەشە لە لەچکەکە جارێکی دیکە لەچکەکەی دایەمەرجانی بیرهێنامەوە.



* * *

نێوان ناخۆشیی دایە مەرجان و ئەفسانە وردەوردە بۆ من ئاشکرا دەبوو. تێکەڵاویی من و ئەفسانە و دایە مەرجان، وای کرد لە خەمە هاوبەشەکانیان تێبگەم و هەست بە جیاوازییەکانیشیان بکەم. دایە مەرجان نیگەرانی ئەفسانە بوو. دەترسا ئەفسانە لەوە زیاتر ئەسپی خۆی لینگ بدات و ڕۆژێک دابێت دۆ و دۆشاو تێکەڵ بکات. ئەفسانەش پێی وابوو دایە مەرجان زیاتر مەیلی بۆ لای مێردی دووەمیەتی. بەڵام ئەفسانە رقی لە وێنەکەشی بوو. دایە مەرجان پێیخۆشنەبوو خولیاکانی ئەفسانە وای لێبکات تووشی مەترسی بێت. ئەفسانە پێچەوانەی دایە مەرجان بیری دەکـردەوە. ئەفسانە ئێستاش بە ئاکارەکانی ئامانج دڵگەرم بوو. پێی وابوو ئەو خولیا و ئاواتانەی لە ئامانجی باوکیەوە بۆی مابوونەوە بە ئاکامێکی خۆشی دەگەیەنن. بەڵام دایە مەرجان لە ئامانج دابڕابوو. ژیانێکی هاوبەشی دیکەی تاقی کردبۆوە و چارەنووس لەویشی دابڕیبوو. دایە مەرجان لە نێوان دوو ئەزموونی جیاوازدا دەژیا. ئەفسانە دڵی لەئامانج بەرنەدەبوو. ڕەنگە هەر لەبەر دڵی دایە مەرجانیش ئەم کوتە پەڕۆ تەنکەی بە سەر ئامانجدا دابێت و لە سەر کتێبخانەکەی دایناببێت.

ئەفسانە دەیگوت، بۆیە وێنەی ئامانجم لەسەر کتێبەکانم دانـاوە، هەستدەکەم هـانمدەدات کتێبی زیاتر بخوێنمەوە. منیش وردەوردە هەستم دەکرد کەوتوومەتە ژێر کاریگەریی ئامانج و ئەفسانە و دەستم بە خوێندنەوەی کتێبەکانی کتێبخانەی ئەفسانە کردبوو. تا کتێبەکانم دەخوێندەوە، زیاتر لە ئامانجی ئەفسانە نزیک دەبـوومـەوە. ئەفسانە ئەوەندە باسی ئامانجی خۆی بۆ کردبووم، منیش وەک ئەو دەمناسی. کتێبخانەکەی ئەفسانە هەرچەندە بە قەبارە بچووک بوو، بەڵام کتێبەکانی لە هەر شوێنێک دەست نەدەکەوتن. ئێستاشی لەگەڵدا بێت، لە ئەفسانەم

نەپرسی ئەم کتێبانەی چۆن پەیدا کردووە. وەک دایە مەرجان دەیگوت، من کاڵەکخۆر بووم نەک بێستانپرن.

دایە مەرجان ئەگەرچی بە حەسرەتەوە لە وێنەکەی لای سەرووی هاڵەکەی دەڕوانی، بەڵام کاتێک لە ژێر تۆڕەکەوە چاوی بە وێنەی ئامانج دەکەوت، پێشی بە ئاشکرابوونی هەناسە قووڵەکەی دەگرت و هێندێکجار نەدەکرا پێش بەو فرمێسکە روونانە بگرێت کە لە گۆشەی چاوەکانیدا قەتیس دەمان. نەمدەوێرا لەبارەی وێنەی لای سەرووی هاڵەکە هیچ لە ئەفسانە بپرسم. هەستمدەکرد ئەفسانە زۆر لەم وێنەیە بێزارە. دیاربوو دایە مەرجانیش وا نییە. جاروبار بە حەسرەتەوە سەیری وێنەکەی سەر میزی تەلەفزیۆنەکەشی دەکرد.

ئەو کاتەی بۆ جاری دووەم بڕیار بوو دوو کارمەندەکەی ئیدارەی بونیادی شەهید بێن و لە بارەی مانەوەی من لەم ماڵەدا پرسیار بکەن، کێشەی نێوان دایە مەرجان و ئەفسانە گەیشتە ئەوپەڕی خۆی.

– باشە کچی من، چدەبێ ئەو وەختەی ئەم مەعموورانە دێن، تۆش لەو بەقوڕێگیراوەبی؟ ئەتوو لە من باشتر زمانیان دەزانی و ئەوانیش باشتر لەتوو حاڵی دەبن. ئەوڕۆ خۆ هەر ناچی بۆ ئیدارە. واباشە ئەگەر ئەوان هاتن، بۆخۆت لێرە بی و قسەیان دەگەڵ بکەی.

– دایەگیان، بۆ لەمن تێناگەی؟ هەر چاوم پێیان هەڵنایەت! پێم خۆش نییە بیانبینم. هەست دەکەم بە چاوی برسییەوە سەیرم دەکەن. ئەوان لە خوایان دەوێت روویان بدەمێ. ئەوکاتەی چاوبرسییانە لێم دەڕوانن، وادەزانم دەستدرێژیم کراوەتە سەر. ئەگەر من پێیان پێبکەنم، وا دەزانن سەنگەرێکی دوژمنەکانیان داگیر کردووە. من نامهەوێ بە پێکەنینی من دڵخۆش بن. خۆ ناشکرێ بە تووڕەیی و جنێوپێدان وەڵامیان بدەمەوە. خۆت قسەیان لەگەڵ بکە. تۆ خانەوادەی شەهیدی ئەوانی...

لێرەدا ئەفسانە زۆر بەتەوسەوە وشەی شەهیدت لەدەمدا هەڵتەکاند.



دوای ئەوەی تۆ بە توڕەییەوە ڕۆیشتی، دایە مەرجان رووی کردە من. دەتگوت هەستی بەم چاوەڕوانییەی من کردووە. دەستی پێکرد:

ئەم کچەتیوە زۆر کەللەڕەقە. ئەوەندە رقی لەوانە دەبیتەوە، بە هیچ جوورێک سەریان وەبەرناهێنێتن. هەر ئیزن ناداتن چاویشیان پێی بکەوێتن. ڕەنگە ئەتوو بە تەواوی ئاگاداری ژیانی مە نەبی. بەسەرێک ئەوڕاست دەکاتن، ئەوان پتر دەیانهەوێتن چاویان بە ئەفسانە بکەوێتن. کچم دەڵێی ناسکەنانە. مردووی بۆ زیندوو دەبیتەوە. ئەوانە هەستیان بەوەش کردووە، کچەکەم کەیفی بەوان نایەتن. هەمیشە وەختی سەردانەکانیان بۆ ماڵە مە وا رێکدەخەن، ئەفسانە لە ماڵ بیتن. ئەویش وەختێک دەزانیتن ئەوان دێن، بە بیانوویەکی دەچیتە دەرێ. ئەوجارە تووڕەم کرد و ڕۆیشت. ناچارم بۆخۆم شتێکیان بۆ هەڵبەستم. ئەمن بەتەواوی لە ئەفسانە تێدەگەم. ئەفسانە کچی پێشمەرگەیەکی شەهیدە و ئەوانیش دەزانن ئەو رقی لەم وەزعەیە و هەروا لەسەر بیر و باوەڕی بابی مایتەوە، بۆیە بەوردی لە بیانوویەکی دەگەڕێن. هەتا ئێستا نەمهێشتووە ئەوان وێنەی ئامانج لەسەر کتێبخانەکەی ئەفسانە ببینن. پێش ئەوەی بێن، دەرکەی ژوورەکەی دادەخەم. هێندەک جاریش هەتا دەڕۆن، وێنەکە لەوێ لادەبەم. نازانم ئەفسانە باسی ئەوەی بۆ کردووی یان نا؟

ئەفسانە کچی مێردی یەکەممە. من و بابی ئەفسانە ئەو وەختەی یەکترمان ناسی، ئەو پێشمەرگە بوو. هێشتا دەوڵەت کوردستانی بە تەواوی لە دەستی پێشمەرگەکان دەرنەهینابوو. ئەوان شەوانە بە گوندەکاندا دەگەڕان. خەڵکیان کۆدەکردەوە و قسەیان بۆ دەکردن. یارمەتیی خەڵکیان کۆدەکردەوە و دەگەڵ خۆیان دەیانبرد. زۆر جاریش دەگەڵ چەکدارەکانی دەوڵەت تووشی شەڕ و پێکدادان دەبوون. قسمەتی من وابوو دەگەڵ ئامانج یەکتر بناسین. ئەو هەموو جارێ ئەگەر رێی کەوتبا لای مە، دەهاتە ماڵمان. بابیشم زۆر کەیفی پێی دەهات. خۆشی

دەویست. بۆخۆم زۆرم پێباش بوو. بابیشم هەمیشە تاریفی دەکرد. دایکم شتی بۆ لە حەوت کەلێناندا دەشـاردەوە. ئەوشەوانەی دەهاتە ماڵمان، هەموومان بەدەوریدا دەهاتین و دەچووین. دوای ئەوەی لێرە ڕۆیشتن و شـەوان لە تاریکیدا دەهاتنەوە، زۆر جاران بە چەند ڕۆژ لە ماڵی بابم دەمـاوە. شەوانە وەدەر دەکەوت و بەڕۆژ دەنشاردەوە. شەوێک لەسەر ئیزنی دایک و بابم لەگەڵیدا ڕۆیشتم. ئەودەمی هێشتا ناچار نەبوون پەنا ببەنە بەر قەندیل. لە ناوچەیەکی شاخاوی چەند گوندێکیان بەدەستەوە مابوو. چووینە ئـەوێ. شاییەکی خۆشیان بۆ کردین. ئامانج وای لێکردبووم دڵم زۆر روون بوو. پێموابوو زوو بە ئازادی دەگەڕێینەوە. دوای چەند مانگێک ناچار بووین ئەوێش بەجێ بێڵین. وردەوردە بەرەو شاخەکانی قەندیل هەڵکشاین. پەنامان بردە بەر قەندیل. لەقەندیل هەستم کرد دووگیانم. دەگەڵ ئامانج و هاوڕێیەکانی وەک ئەوخەڵکەی لەگەڵندابوون، خانوویەکمان لە قووڕ ودارو بەرد دروست کرد. من قوڕ و بەردم وە ئامانج دەدا و ئەویش لەسەر یەکی دادەنا و دەیکردە دیوار. نێو ژوورەکەمان بە قوڕ و کا سواغ کرد. پێکەوە لەوێدا دەژیاین. ئەتۆش کوڕی خۆمی، ئێوارەیەک ئامانجیش لەماڵ نەبوو، ژانی ئەفسانە دایگرتم. پیرەژنێکی جیرانمان بە ناوی پورە مرۆت لەگەڵ تاقانە کوڕەکەی لەوێ بوو. دڵی بڕوایی نەدابوو کوڕەکەی بڕوات و ئەویش بێکەس و بێدەر لێرە بمێنێتەوە. هەمیشە دڵی دەدامـەوە و دەیگوت خەمت نەبێ ئیشاڵڵا زۆر زوو دەگەڕێینەوە. تۆ ماڵوحاڵی خۆت پێکەوە دەنێی و منیش بووکی سوور بۆ کوڕەکەم دادەبەزێنم. دەیگوت هەتا بە ئازادی نەچینەوە، ژنی بۆ ناهێنم. ئەو ناوکی ئەفسانەی بڕی.

نیوەشەوێک ئامانج گەیشتەوە. چاوی بە ئەفسانە کەوت و دەستی کرد بە شایی و گۆرانیگوتن. بۆ شەوی دواتر برادەرەکانی دەعوەت کرد و ناویان بۆ ئەفسانە دانا. برادەرەکانی ئامانج یەکێکیان بانگی بە گوێی



ئەفسانەدا دەخوێند و یەکی دیکەیان گۆرانی بۆ دەگوت. ناوەکانیان لە چەند کوتە کاغەزێکدا نووسی و خستیانە نێو تۆربەیەکەوە. بەمنیان گوت، دەست بخەمە نێو تۆربەکە و کوتە کاغەزێک دەربێنم. هەر ئەو ناوەی ئامانج نووسیبووی، بە دەستمەوە هات. ناوی ئەفسانە زۆر بە دڵی ئامانج بوو. هەتا خۆڵەبانی چاوانم دەکەن، ئەو شەوەم لەبیر ناچێتەوە. لەوەتی وەبیرم دێت، هەر ئەو تاقە جارە ئەوەندە دڵن خۆش بووە.

ئەگەر باسی ئەو چەند ساڵەی قەندیلت بۆ بگێڕمەوە، بە ساڵێکیش تەواو نابیتن. سەرت نەیەشێنم، ئاخری ئامانج لەگەڵ چەند برادەرێکی دیکەی بەسەر کەمینی هێزەکانی حوکمەتدا کەوتن. جەنازەکەی کەوتە دەست ئەوان و پاشان دابوویانەوە بە خـەزوورم و ناشتبوویان. ئەو کاتەی ئامانج بەیەکجاری ڕۆیشت، ئەفسانە کلاسی چوارەمی سەرەتایی بوو. ساڵێک بەسەر شەهیدبوونی باوکی ئەفسانەدا تێپەڕی. من عافرەتێکی نەخوێندەوار بووم. حەسرەتی نەمانی ئامانج و بێدەرەتانیی خۆم و ئەفسانە و فشاری باب و براکانم، ناچاریان کردم بێمەوە. زیاتریش بۆخۆم پێمباشتربوو بێمەوە. هەموو شتێکی ئـەوێ ئامانجی وەبیر دێنامەوە. ئەوەندەی دوای ئەو لەوێ بووم، هەمیشە لەبەر چاوانم بوو. نەمدەتوانی چاو لەبرادەرەکانی بکەم. چاوم لە خانوەکە دەکرد، ئامانج دەهاتەوە بەرچاوم، چۆن بەردی لێوەردەگرتم. لەسەر یەکی دادەنا و بە قوڕەکە کەلێنەکانی پڕ دەکردنەوە. شەوانە خەوم لێ نەدەکەوت. چاوم لە ئاڵوودارەکانی میچەکە دەکرد و وەبیرم دەهاتەوە چۆن ئامانج لەگەڵ ئەفسانە ئاڵوودارەکانی دەژمارد و بەم جۆرە ئەفسانەی فێری حیساب دەکرد.

هاتینەوە. لێرە پێم خۆش بوو بەتەنێ خۆم ئەفسانە گەورە بکەم. بابم هەوڵیدا بە ناوی خۆی شوناسنامەی بۆ وەربگرێتن. لەو ماوەیەدا ئەو ئامۆزایەی دایکم هاتوچۆی دەکردین. دەیگوت، دەتوانیتن شوناسنامەش

بۆ ئەفسانە وەربگریتن و کارێکی واش بکاتن لە سالێکدا لە دوو ئیمتیحاندا بەشدار بیتن و بەسالێک کارنامەی دوو سالی خوێندن وەربگرێتن. ئەفسانە زۆر زیرەک بوو. ئەوانەی دەیاندیت، دەیانگوت، دەتوانێ یەکجێ ئیمتیحانی پێنجی ئیبتدایی بداتن. دایک و بابم پێیان خۆش بوو ئەمنیش مێرد بەو کابرایە بکەم. سەرت نەیەشێنم، دوای ئەوەی مێردم پێکرد، زانیم دەستی دەگەڵ دەوڵەت تێکەڵە. شەوانە بە چەکەوە دەهاتەوە ماڵ. ئەفسانە بە هیچ جۆر دەگەڵی پێک نەدەهات. سەرەتا وایزانی بەدزیی حوکمەت چەکی پێیە. پاشان وەختایەک زانی پیاوی دەوڵەتە، زۆری لێبێزار بوو. ئەو کابرایە بەناوی خۆی سجیلی بۆ وەرگرت و ئەفسانە بوو بە کچی خدر و بە سێ ساڵ کارنامەی پێنجی سەرەتایی و ئەوەڵی راهنمایی وەرگرت. ئەوەی لە قوتابخانەی شۆڕش لە قەندیل بە فارسی خوێندبووی زۆر چاک بەکەڵکی هات. بەڵام خوێندنەوە و نووسینی کوردی لێرە بۆمن بووەتە دەردیسەر. هێندێک جار دەڵێم، خۆزگە ئەوە هەر فێر نەبایە. دەڵێم ئەگەر لەوێش هەر بەفارسی خوێندبای، لێرە تووشی ئەو ڕۆژگارە نەدەبووین. جاری واشە، دەڵێم قەیدی ناکات، با بەدوای ئاواتەکانی بابیدا بچیتن. لێرەش وازی لە کتێب خوێندنەوە نەهێنا. کتێبی لەملا و لەولا کۆدەکردەوە و وردەوردە ئەو کتێبخانەیەی پێکەوەنا.

خدر هێندێک شەو نەدەهاتەوە ماڵ و بەیانی دەیگوت، ئەوشەو نۆبەکێشک بوومە، بۆیە نەهاتوومەوە. بەیانەیەک جەنازەی خدر و چەند چەکداری دیکەیان هێنابۆوە. ئەویش لەو گوندانەی بنار خەریک دەبن کەمین بۆ پێشمەرگەکان دابنێنەوە. لە بوومەلێڵی نوێژی شێواندا بۆخۆیان بەسەر کەمینی ئەواندا دەکەون. دوای ئەوەی هەموویان دەکووژن، چەک و چۆڵەکەیان دەبەن و گیرفانیشیان دەپشکننەوە. پاش دوو ڕۆژ لە رادیۆ نێویان بە جاشی کوژراو خوێندبوونەوە. دوایە درەنگ زانیم ئەفسانە



ئەودەمی لە ماڵی هەناری دەستەخوشکی گوێی داوەتە خەبەری رادوێی پێشمەرگەکان و دەنگەکەشی زەفت کردووە. ئیدی ئەوجار نەچوومەوە ماڵە بابم. دەوڵەتیش ئەم خانوەی بۆ دروست کردین و ئێستا تێیدا دانیشتووین. ماڵە مە لەدەرەوەی خانوەکانی بونیادی شەهیدە. ئەو ماڵانەی ئەوبەر دەبینی خانوەکانیان وەکی یەکن، بەوێ دەڵێن بونیادی شەهید. مانگانە حقوقێکمان دەدەنێ. ئەمەش سەر بە بونیادی شەهیدین. ئەفسانەشیان لە ئیدارەی کەشاوەرزی دامەزراندووە. بەڵام ئەو کچە بە هیچ کوللووەجێک روویان تێناکاتن. ئەوەتا ئەوە لەکنەخۆ ئەورۆ تەعتیلە، ڕۆیشت و خۆی شاردەوە. ئەوانیش شکیان کردووە. دەزانن لەبەر ئەوان دەڕوات. ترسی دیکەشم هەیە. دەترسێم لەدەرەوە بەدوای وەبن. چەندی حەولیش دەدەم مێردی ناکاتن. داخوازی زۆرن، هەر دەڵێ ئەوەی من دەمەهەوێ، هێشتا نەهاتووە. ڕەنگە بۆخۆی کەسێکی بنیات نابی. بە ناحەقیشی نازانم با بە کەیفی خۆی بکاتن و دوایە وەک دایکی چارەڕەش نەبیتن. دیارە ئەمنیش بە دڵی خۆم کرد، بەڵام ڕۆژگار وای لێهات. ناعیلاجم بۆ خۆم شتەکی بۆ ئەو مەعموورانە هەڵبەستم و ئەوجاریش لەکۆڵە خۆمیان بکەمەوە.

– دایەمەرجان، بە بڕوای تۆ باشتر نییە وەختێک ئەوانە دێن، من لێرە نەبم؟

– ...

* * *

تەهمینە مۆڕەیەکی قووڵی لە قاچاخچییەکە کرد. لەوکاتەوە لەگەڵ تەهمینە و توورەجدا تووشی ئەم سەفەرە هاتووین، ئەم ژنەم بەم شێوەیە نەدیوە. تووڕەیە. ئاگری لێدەبارێت. کاتێک ژن تووڕەدەبێت و خۆی قرژ دەکاتەوە، ئەم هەموو ناسکییەی خێرا گۆڕانی بەسەردادێت. بەچەشنێک دەگۆڕێت، هەست ناکەی لە بەرانبەر مرۆڤێکی لەشناسکی

دڵناسکدا وەستاوی. وا لەخۆی دەکات، دەڵێی ئەم لەشە لە ئەزەلەوە بۆ شەڕ و پەرچەکردار و تووڕەیی خوڵقاوە. سەرەڕای ئەوەش تووڕەیی ژن لەگەڵ هی پیاو زۆر جیاوازە. پیاو زۆرجار لەوپەڕی دەستەڵاتداریدا تووڕە دەبێت و وەک تووڕەیەکی خوێنتاڵ دێتەبەرچاو. ژن کەتووڕە دەبێت، بێدەستەڵاتی تووڕەی دەکات. ئەمەش جوانیی تایبەت بەخۆی هەیە. تەهمینە لە بێڕێزیی قاچاخچییەکە تووڕە بوو. ئەو لە بێدەستەڵاتیی من و تووڕەج و دوو ئەفغانییەکە تووڕە بوو. دیاربوو لە هەمووی زیاتر لە بێدەستەڵاتیی خۆی تووڕەیە. بەچاوێکی نزمەوە سەیری ئێمەی دەکرد. من لەوکاتەدا هەستم بە دەروونی تووڕەج دەکرد. ئەو لەم چیاوچۆڵە نەناسراوە، لەبەردەم چارەنووسی نادیاریدا تەنیا بە نیگای چاوەکانی بە تەهمینەی دەگوت ددان بە جەرگی خۆیدا بگرێت. تەهمینە واز لە منیش ناهێنێت. لێم دەبێتەوە بە ئەفسانە. ئەفسانەی رووت.

تووڕەج دیتت تا نەبۆوە بە ئەفسانە، رووت نەبۆوە؟

ئەفسانەی رووت هەموو ماسوولکەکانی لەشی ڕێک هاتوون. دەڵێی خەریکە خۆی ڕێک دێنێت و بەتەمایە بە قەڵەمبازێک خۆی باوێت.

یەکەمجار بوو دوای ئەوەی تۆ دەهاتیە ژوورەکەی من، دایە مەرجان ئەوا بەدواتدا بێت. زۆر لام سەیر بوو، وا بەپەلە خۆی بە ژوورەکەدا کرد. من سەرەتا وامزانی دایە مەرجان دڵپیسی لە من دەکات. ئەوکاتەی تۆ قسەت دەکرد، دایە مەرجان و منیش دەممان بەش کردبۆوە. لەدواوە سەیری تۆمان دەکرد. بە تووڕەییەوە ئاوڕت دایەوە. نازانم بەسەر منتدا دەگوڕاند یان بەسەردایە مەرجاندا. دیاربوو هیچ پێت سەیر نییە، دایە مەرجان بەدواتدا وەژوور کەوتووە. هەموو لەشت تووڕەیی لێدەباری. من ئەوکاتە هەستم کرد هەموو ئەندامەکانی لەش دەتوانن تووڕەبن. سینگت خۆی دەدایە بەرەوە و دەکشایەوە. پەنجەکانت بە بێزارییەوە قژەکانیان بەرەو دواوە فڕێدەدایەوە. قژەکانیشت بە تووڕەییەوە



هەڵدەبەزینەوە و بە زەحمەت لە نێوشانتدا ئارامیان دەگرت. لێوت ئەوەندە خێرا دەجووڵان، دەمت زیاتر وەک جووڵەی خێرای ئامێرێکی ئەلەکترۆنی دەچوو. پەنجەی پێی ڕاستت بەجۆرێک لەزەوییەکە دەدا، دەتگوت، ریتمێک بۆ کەرەنای دەستپێکردنی جەنگ رێکدەخەی.

– من چدیکە تاب ناهێنم. ئەوانە شەڕیان لەگەڵ منە. دەیانهەوێت وردم کەن. دەیانهەوێت کەس بەدەورمەوە نەبێت. کەس نەناسم! ئاموشۆی کەس نەکەم. لەدەرەوە بەوردی چاودێریم دەکەن. نازانن من زۆر لەوان زیرەکترم. دایکە گیان! تۆ زۆریم لێ دەکەی. چۆن من بەقسەیان دەکەم؟ هەرچی ئەوان پێیان خۆش بێت نایکەم.

نەمدەوێرا بڵێم دانیشە، یان دەنگت نەوی بکە. بە هاتنەژووری دایە مەرجان هیچ تێک نەچووم. لەم هەڵلاوبگرەدا زۆریشم پێخۆشبوو. سێجار فەرمووم لێکرد دانیشێت. ئەفسانە دەڵێی کۆنترۆڵی خۆی لەدەست داوە. بێنێوەپێدان و بڕانەوە قسە دەکات.

– دەست لە ژیانی من وەردەدەن. لەوە زیاتر تاب ناهێنم. باشە ژیانی من بەوان چی؟ بە ئەوان چی من چیدەکەم و چۆن دەژیم؟ هەموویان چاوحیزن. دەیانهەوێ لێم نزیک ببنەوە و لەگەڵم تێکەڵ بن. تۆ دەتهەوێ خۆمیان بۆشل بکەم؟ تەماحیان تێکردووم و هەوڵ دەدەن بمڕوخێنن. دەیانهەوێت دەستیان لەگەڵدا تێکەڵ بکەم. بەکەیفی خۆیان سوارم بن. ئەوە کاری من نییە. دەزانی من کچی کێم؟ تاکە بیرەوەرییەکی ئامانج بە هەموو ئەمجۆرە ژیانە ناگۆڕمەوە. تۆ وا دەزانی ئەوان خۆشبەختیی منیان دەوێت؟

– کچم گیان بۆ ئەوا دەخۆت نووساوی؟ ئەمن کەنگێ کوتوومە لێیان نزیک بەوە؟ دەڵێم نابێ ئەوا لێیان هەڵچەرخییەوە. چ دەبوو هەتا ئەوان دەهاتن و دەڕۆیشتن لەماڵێ مابایەوە. ئەتوو لەمن باشتر تێیاندەگەی و دەتوانی جوابیان بدەیەوە.

– باشە من باش تێیاندەگەم، بۆیە نامهەوێ هەر بیانبینم. ئەوە نییە هەڵیانپێچاوی ڕەزا لەماڵ وەدەر بنێی؟

– ئەوان نەیانگوت، ڕەزا وەدەر بنێ. لێیان پرسیم ئەم کرێنشینە موجەڕەدە، یان ژن و منداڵی هەیە. ئەمنیش پێم گوتن، پێموابێ ژنی هەیە و جارێ لەگەڵ خۆیدا نەیهێناوە.

– دەی باشە ئێستا دەبێ خۆت ئەوە چارەسەر بکەی. بزانە چۆن ژنی بۆ پەیدا دەکەی. خۆ بزانن موجەڕەدە ناهێڵن یەک دەقەش لێرەبێت.

ڕق و کینەی ئەفسانە خاوبوونەوەی نەبوو. بە دزیی دایە مەرجان، لەژێرەوە سەیرێکی منی کرد.

ئەم ڕوانینەت خۆشەویستییەکی قووڵی لێ دەبارێت، ئەفسانە! بەڵام لەبەر دایە مەرجان بە ڕقێکی دەستکرد داتپۆشییەوە. ئای نیگای خۆشەویستانە، لەنێو ئەم تووڕەییەدا چەندە جوانی. دەڵێی لە وشکارۆیەکی کاکیبەکاکیدا لە نەکاو کانیاوێک هەڵدەقوڵێت و تۆش لەوپەڕی تینوێتیدا بەسەریدا کەوتووی.

عیلاجێکم لێبکە، ڕەزا بوڵوتئۆغڵوو لێی قەوماوە. لێرە ڕەزاعەجەم خەریکە چوارپەلی لەنێو داوێکی مەترسیداردا پێوە دەبێت. ڕەزای بوڵوتئۆغڵوو چووبایە سەرچۆمی ئارازیش، لەداخانی وشک دەبوو. لێرەش ئەوە هەر نەهامەتییە و ڕووم تێدەکات. عیلاجم لێ بکە ئەفسانە! ئەگەر لە هەموو داوەکان دەربەرم، خۆ زەحمەتە لە داوی تۆ دەرباز بم. داوی ئەفسانە، قاچ و دەست و لووت و زمانمی لێک شەتەک داوە.

– دەی باشە، کچی خۆم ئەم هەموو هاوڕێ کچەت هەیە، یەکیان ڕازی بکە و با ببێت بە هاوسەری کاکە ڕەزا. ئەگەر باوەڕم پێدەکەی بەدڵ پێم خۆشە لێرە بمێنێتەوە. ئەدی نەتدی خۆم بەزۆر هێنام بۆ ئێرە؟ وەک کوڕی خۆمان شاییشی بۆ دەکەین.

– من هەرگیز شتی وا ناکەم. ئەوە شتێکە دەبێ ڕەزا و ئەو کەسەی



دەبێتە هاوبەشی ژیانی بیری لێبکەنەوە. ئەوەی تۆ دەیڵێی هی سەردەمی ئێوە بوو. تۆ دوای نەمانی ئامانج بە نابەدڵی بووی بە هاوسەری خدر. ئێستاش دەتهەوێ دوو کەسی دیکە بە نابەدڵی لەپاڵ یەکتر بخزێنی؟ لەبیرت چووەتەوە ئەو ماوەیە لەگەڵ خدردا بووین، چ ئازارێکمان چێشت؟ من لەگەڵ دوژمنی باوکم دەژیام و تۆش لەگەڵ کەسێک کە هەم بەنابەدڵ مێردت پێکردبوو و هەم لە سەنگەری دوژمنانی خۆشەویستە لەدەستچووەکەتدا بوو. نەخێر من کاری وا ناکەم.

– ڕۆڵەگیان. چ دەرمان بکەن و چ ئاو بخۆنەوە بۆئەوان وەک یەکە. ئەمە دوو عافرەتی بێدەرەتانین. باشە لێرە بۆخۆن سەرن پێکەوەناوە و بەبێمنەتی دەژین.

– بێمنەتی چی؟ ئەوە نییە ریشمان لەبەردەستی ئەوانەدایە؟ ئەوە نییە هەر ڕۆژەو بیانوویەکمان پێدەگرن؟

دایە مەرجان هەست دەکات ئەفسانە ئارامتر بووەتەوە. خۆشی کەمێک وەخۆ دێتەوە. پشوویەک دەدات و لەسەرخۆتر لە پێشوو دەڵێ:

– دەڵێم شتێک بڵێم ئەویش لەبەر ئەفسانە ناوێرم.

– بۆ لەبەرمن ناوێری؟ خۆ من هیچی خراپ ناڵێم. دەڵێم ئەوانە بۆ ئەوە نابن لێیان نزیک بیەوە.

– باشە من فکرێکم کردووەتەوە، بزانم پێت چۆنە، ئەفسانە؟ هەنار، هەتا دەست هەڵبێنی کەڵەگەت و باڵابەرزە و یەک پارچە گوڵە. ڕەفیقی خۆتە و لەمن باشتر دەیناسی. دەی کچی خۆم، با کاکە ڕەزا خۆی پێشان بدات و ئەتووش بیدوێنە. بەڵکو یەکتریشیان خۆش بوێت. ئەو دەمی هەردووکیان دەحەسێنەوە. دەڵێی خوا بۆ یەکتری داناون.

– چۆن شتی وا دەبێ دایە؟ هەر نابێت. دوایی ئێمە دەبینە باعیسی ژیانیان و ڕەنگە هەر بۆ خۆشیان قەت پێیان خۆش نەبێت.

– دەنا هەر نەبێ کارێکی وا بکە پێکەوە خۆیان پێشانی ئەوانە بدەن و

بڵێن ژن و مێردین. ئەوانیش واز لە مە دێنن. خۆئەگەر وانەکەین ناچار دەبین جێیەکی دیکە بۆ کاکە رەزا پەیدا بکەین.

– باشە دایە مەرجان لازم بەو زەحمەتە زۆرەی هیچکامتان ناکات. پێم خۆش نییە نە تۆ و نە ئەفسانە خانوم بەدەست منەوە ئەوەندە نارەحەت بن. هەوڵ دەدەم جێگەیەکی دیکە بدۆزمەوە.

– شتی وا هەر نابێت. لەداخی ئەوانە ناهێڵم لێرە وەدەرکەوێت. دایە مەرجان، هیچ نیگەران مەبە بزانە چۆن وادەکەم ئەوانە توخوون ئێرە نەبنەوە. مەگەر ئەفسانە نەبم!

دوای ئەوەی دایە مەرجانم بەڕێکرد و لە قاڵدرمەکانی حەوشەکە بەرەو ماڵی خۆیان سەرکەوت. لەگەڕانەوەدا لەژوورەکەی خۆمدا، بە چەشنێک بەسەر ئەفسانەداکەوتم سەرم لێسووڕما.

تا ئێستا تۆم نەدیبوو بەم شێوەیە لەسەر گازەرەی پشت ڕاکشابی. لەسەر پشت هەردوو دەستت دەبەریەک نابوون و هاویشتبووتنە پشت سەرت. ساف و لووس ڕاکشابووی. بەژنت لەگەڵ ئەوکاتەی بەپێوە رادەوەستای، زۆر جیاواز بوو. بلووزەکەت کەمێک هەڵکشابوو. خەتێک لەپێستی سپیت بە پانتایی قایشەکەی دەوری کەمەری شەڵوارەکەتدا بلووز و شەڵوارەکەتی لێک جیا دەکردەوە. هەردووک سەری خەتە بازنەییەکە بە ئەمدیو و ئەودیوەی کەمەرتدا بە نێوان خۆت و مافوورەکەی ژووری مندا ئاوا دەبوون. حەزم دەکرد باوەشت پێدا بکەم. ئەو فرمێسکە روونانەی بەسەر هەردوولا گۆناتدا دابەش دەبوون، پەشیمانیان کردمەوە. سەرینێکم هێنا. بێئەوەی دەنگ بکەم، دەستم نایە ژێر سەرت. چاوت هەڵێنا. سەرت کەمێک زیاتر لە بارستایی سەرینەکە بەرزتر کردەوە. کەوتە ژێر سەرت و کەوتیەوە. ئەوەندەی پێوەنەچوو، لەناکاو وەک پشکۆیەکی ئاگریان پێوەنابی، لە جێگەی خۆت دەرپەڕی و قیت دانیشتی.



– رەزا وەرە. فکرێکم کردەوە!

– چییە؟

– هەنار! هەناری هاوڕێم، دایە مەرجان ڕاست دەڵێت. هەنار زۆر باشە. لەم کێشەیە نەجاتمان دەدات.

– ئاخر من هەنار ناناسم و ئەویش نامناسێت. چۆن دەبی؟ دەبێ چی بکەین؟

– چۆن دەبێی چی؟ خۆ نامهەوێ ئێوە پێکەوە بن. فێڵێکم دۆزیوەتەوە. فکرێک لەمێشکمی داوە. دەزانی چی؟ ئەگەر ڕاستت دەوێ من لەتۆ زیاتر بیر لەکەس ناکەمەوە. من و تۆ کەس ناتوانێت لێکمان دابڕێت. بەڵام بۆ ئەوەی خۆمان لەدەست ئەم بونیادی شەهیدە نەجات دەین، فکرێکم کردووەتەوە. من هەنار رازی دەکەم لەگەڵمان بێتە لای قازی و بڵێت ئەوە مێردی منە. قازیش دەفتەرچەی ئیزدیواجتان بۆ دروست دەکات. کۆپیەکی لێهەڵدەگرینەوە. دەیدەین بە دایە مەرجان با بۆیان بەرێت و ئەوان لەکۆڵمان دەبنەوە.

– باشە ئەم ئیزدیواجە لای قازی شاهید و شتی وای ناوێت؟

– با جارێ هەنار ببینین، ئەویدیکە هەمووی فشەیە. ئەو مەلایەی من دەیناسم، بە پارە هەموو شتێک دەکات. ئەوەندەش چاوحیزە، چاوی بە من و هەنار بکەوێت، پارەشی لەبیر دەچێتەوە. هەموو کارەکانمان بۆ دەکات.

دایە مەرجان ڕاستی گوت. هەنار هەتا دەست هەڵبێنی کەڵەگەتە. شانی لەسەرووی شانی منە. نێوقەدی باریک و سینگی پانە. لە ئەفسانە بەرزترە. زۆرجوانە. سەرەتا کە قسە دەکات و پێدەکەنێت، هەست دەکەی ئەوەندە جڵفە بۆ ئەوە نابێت بۆ ماوەی پێنج هەنگاو لەبەرچاوی خەڵک لەگەڵی بەڕێگادا بڕۆی. بەڵام کاتێک زیاتر تێکەڵی بووم، هەستم کرد کوڵاوی نێو پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانە و لە یەکەم دیتنیدا پێچەوانە بەهەڵەتدا دەبات. باشە چۆن دەبێت هاوڕێی ئەفسانە بێت و باش نەبێت؟

* * *

ئەم قاچاخچییە سەیرە. بڵێی هەست نەکات ئێمە هەرچوارمان دەزانین ئەو چۆن دەڕوانێتە تەهمینە؟ چاوەکانی وەک مار دەڕوانن. جاری وایە هەست دەکەم ڕوانینی چاوەکانی وەک مار بە نێوان من و بورهانەدین و تەیمووردا تێدەپەڕن و لەپەنا تووڕەجدا لەسەر تەهمینە خۆ دەگرنەوە. تەهمینە بە گەوجیەتی قاچاخچییەکە پێدەکەنێت. ئەفسانەش بە گەوجیەتیی مەلا پێکەنی.

– ماموستا ئەم هەنارخانم و کاک ڕەزایە دڵیان چووەتە یەکتر و دەیانهەوێت ببن بە هاوسەر. ئەوە هاتووینەتە خزمەت جەنابتان کاروباری قانوونیان بۆ جێبەجێ بکەی.

– چۆن شتی وا دەبێت، خانم؟! ئەدی شاهیدێک، مارەبڕینێک، خزم و کەسێک؟ من ناتوانم کاری وا بکەم.

ئەفسانە لە میزی مەلا نزیک بۆوە. بە باڵا بەرزەکەیەوە بەرەو لووتی مەلا نەوی و شتێکی بە گوێیدا چرپاند. هەناسەی ئەفسانە بنانگوێی مەلای گرتەوە. مەلا چاوی شۆڕ کردنەوە و دەتگوت ماری چاوەکانی بە سەر ئاخرین دوگمەی سەرووی مانتۆکەی ئەفسانەدا خۆیان بەنێوان هەردوو مەمکی داکرد. وابزانم ئەفسانەش هەستی پێکرد. بەتوندی کشایەوە و لە ڕیزی ئێمە لەسەر کورسی دانیشتەوە. ئەفسانە و هەنار منیان خستبووە نێوان خۆیانەوە. مەلا بۆ گواستنەوەی نیگای لەسەر ئەفسانەوە بۆ سەر هەنار و پێچەوانە، ناچار بوو خێرا بەسەر مندا تێپەڕێت. چاوی مەلا دەتگوت، دوو هەڵماتە شووشەن و خێرا ڕاستوچەپیان دەکرد. لەلای خۆم چاوبرکێی مەلام خێراتر دەکرد. ئەمجارە وەک دوو کەللا شووشە دەچوونو بەدەوری خۆیاندا دەسووڕانەوە.

– باشە ئەوە کاکە ڕەزای خۆمانە و هەموو کارەکەی بۆ جێبەجێ دەکەین. بێزەحمەت خانم تۆ تەشریف بێنە ئێرە.

هەنار هەستایەوە.



– نانا، ئەو خانمەی دیکە. ئیسمی شەریفت؟

– ئەفسانە.

– ئەفسانە خانم، بێزەحمەت؟

مەلا لووتی لە گوێی ئەفسانە نزیک کردەوە. کاتێک زایەڵەی هەناسەی مەلا بەر هەنیەی ئەفسانە کەوت و بۆی گەڕایەوە. مەلا ڕەنگی بەتەواوی گۆڕا و ئەفسانە لەجێگەی پێشووی دانیشتەوە.

– دەستت خۆش بێ ماموستا، بابەتی زەحمەتەکەشت لە خزمەتت داین.

ئەفسانە پوڵەکەی لەسەر میزەکەی پێش مەلا دانا.

– ئەوەی نەدەویست، بەڵام بە تەبەڕوک وەریدەگرم، بەزیاد بێت. بێزەحمەت شوناسنامەکانتان؟

ئەفسانە شوناسنامەکانی لەدەستمان دەرهێنا و لە پێش مەلای دانان.

– هەنار خانم، جەنابت جاری دیکە شووت کردووە و تەلاقت وەرگرتووە؟

– بەڵێ.

– ڕەنگە زۆر کارتان بەم ئیزدیواجە نەبێت، ئێستا بە ئەفسانە خانمم گوت، پاشان چلۆن دەتوانن ئەم نووسینەی من لە سەر سجیلەکانتان ڕەش بکەنەوە. ئەگەر وانەبێ، دەبێ بۆ جیابوونەوەش بێنەوە لای خۆم. بێزەحمەت وەرە ئیمزایەک لێرە بکە. کاتێک هەنار بۆلای من دەگەڕایەوە، دووکەللا شووشەکەی پشت لووتی مەلا هاوتەریبی یەکتر سێرەیان لە کەمەربەرەوژێری گرتبوو.

مەلا گوتی: سبەی دەفتەرچەی ئیزدیواجتان حازر دەبێت، یەکێکتان وەرن بیبەنەوە، موبارەکە.

* * *

ئەوڕۆژەی سەر سنووری ئێران و تورکیا درێژترین ڕۆژی ژیانم بووە. هەموومان چاوەڕوانین ئێوارە دابێت و ئاوای دیوی تورکیا بین.

قاچاخچییەکەش مشەوەشە. ڕەنگە ئەویش بۆ ئێوارە بەپەلە بێت. ڕەنگە بۆ تاریکانی شەو مرخی لە تەهمینە خۆش کردبێ.

بڵێی توورەج و تەهمینە لە تاراوگەدا لێک جیا نەبنەوە؟ هەنار بەهۆی سیاسی لە مێردەکەی جیا ببۆوە. مێردەکەی ویستبووی ئەو هاتوچۆی ئەفسانە نەکات. هەنار چەندە خوێن شیرینە؟ دەیگوت: کێ دەتوانێ لە ئەفسانە دوورکەوێتەوە.

هەنار بە پێکەنینەوە خۆی بە ژووری ماڵی دایە مەرجاندا کرد. ئەفسانەی لەگەڵدا بوو. چەپڵەی لێدەدا و هەلهەلەیەکی کێشا. هەنار میرزا مەحموودی ڕەهنمای چەندین ساڵ لەمەوبەری هێنامەوە یاد. ئەویش وەک میرزا مەحموود کاتێ وەژوور ماڵی دایەمەرجان کەوت سەری زۆر لەسەردەرانەی دەرگاکە بەرزتر بوو.

– دایە مەرجان بۆ چەپڵە لێنادەی؟ ئەوە نییە بووکمان پێیە؟

– پیرۆزە لە هەناریش و لە کاکە ڕەزاش، یاخوا وەڕاست گەڕابا.

دایە مەرجان بەشێوەیەک بەهەناردا نووسا، دەتگوت نۆبووکی ڕاستەقینە ماچدەکات. ئەفسانە دەفتەرچەی ئیزدواجەکەی لە جانتاکەی دەرهێنا و کردییەوە. چەند فۆتۆکۆپییەکی لێهەڵگرتبۆوە. لەگەڵ کۆپی شوناسنامەکانی من و هەنار دایە دەست دایە مەرجان.

– بگرە دایە، ئەوانەیان بۆ ببە و بڵێ ژنەکەشی هێناوە و پێکەوە دەژین. تاریخی ئیزدواجەکەش ساڵێک لەمەوبەر نووسراوە. هەر کات پێویست بوو، هەنار ئامادەیە هاوکاریمان بکات.

– باشە ڕۆڵە گیان، یاڕەبی بەختەوەر بی. خۆ ئەگەر بەقسەی دایکی خۆت دەکەی، ئەوە بە یەکجاری بەختەوەر بوویە.

– دایە مەرجان سوپاست دەکەم. من بە کاک ڕەزاشم گوتووە و ئەفسانەش ئاگادارە. لەبەرخاتری ئەفسانە و دیارە لەگەڵ کاک ڕەزاشدا ئاشنا بووین. وەک دۆست و هاوڕێ ئەم کارەم کردووە و



پێموایە یارمەتییەکە بۆ ئێوە هەمووتان. من ئەوەندەی لەدەستم بێت، لە خزمەتتانادم. ئێمە هەرسێکمان لە ئاستێکی وا داین هەست بەم بەرپرسیاریەتیانە بکەین.

ڕوانین و قسەکردنی بێباکانەی هەنار پێیەوە دیاربوو باش دەرهاتووە و ڕەنگە وەک ئەفسانەش شارەزا بێت.

لەو کاتەدا نە بیرم لە تێکەڵبوون لەگەڵ هەنار دەکردەوە و نە لەوفکرەدابووم چۆن لەوە زیاتر دڵی ئەفسانە بەدەست بێنم. دەترسام کەینەوبەینەی ئێمە لەگەڵ هەنار ئاشکرا بێت. زیاتر لەو خەیاڵەدا بووم چۆن هەنار و مێردەکەی پەیوەندیی هاوسەریی خۆیان بە کێشەی نێوان بۆچوونە سیاسییەکانیانەوە بەستووەتەوە. باشە ئەگەر یەکتریان خۆش ویستبێ، چۆنە مێردەکەی لەسەر ئەوە پێداگر بووە خەباتی چینایەتی وەپێش خەباتی نەتەوەیی دەکەوێت و بە هۆی ئەم جیاوازیی بۆچوونە وازی لەم باڵا بەرز و ڕوخسارە شیرینە هێناوە؟

ئەم شارە زۆر سەیرە. لەتەورێز هەستم نەکرد کەس خۆی بەم شتانەوە ماندوو بکات.

* * *

وردە وردە خۆر بۆ پشت کەژەکانی خۆرئاوا دادەکشا. هەرچەندە بۆ پەڕینەوە بۆ نێو خاکی تورکیا لە دڵەڕاوکێدا بووین، بەڵام من زۆر کەیفم بەو ساتەی ئێوارە درەنگانی نێو ئەم کوێستانە زەنوێرە هات. لە بێدەنگیدا هاشەی ئاوەڕۆی کانیاو و بەفراوەکان تێکەڵی شنەبایەکی فێنک بووەتەوە. حەز دەکەم لێرە زەمەن ڕاوەستێت و چیدیکە نەچێتە پێش. پێموابێت توورەج و تەهمینەش حەزیان لەوەستانی کاتە. ئەوان لە تاریکانی شەودا لەو داوە دەترسن ڕەنگە قاچاخچییەکە بۆ تەهمینەی نابێتەوە. دیارە بورهانەدین و تەیموور بەپەلەن. ئەوان کوڕی شەڕی ماڵەوماڵی هەرات و قەندەهار و کابولن و چەندین جار بە کێوەکانی

نێوان ئەفغانستان و ئێران و پاکستاندا ئەمدیو و ئەودیویان کردووە. تەیموور دەڵێت، جارێکیش تا نزیک خاکی تورکیا هاتووە و هێزەکانی ئێران گلیان داوەتەوە.

تاریک داهات. بە رێنوێنیی قاچاخچییەکە وەڕێ دەکەوین. بەرەو چیایەکی ئەستەم سەرمان دەخات. لەدەوری یەک کۆمان دەکاتەوە و دەڵێت:

– هایدارێ خوە بن. دەنگێ خوە کێم کەن و دیڤ مندا وەرن. عەسکەرێ ترکان لسەر ڤی چیاینە.»

بەسرتە بۆ ئەوانی دیکە تەرجومەی دەکەمەوە. بورهانەدین و تەیموور پێیان لە جێگە پێی قاچاخچییەکە دەنێن. توورەج و تەهمینە لەمن دوور ناکەونەوە. تەهمینە دەیهەوێت لە نێوان من و توورەجەوە بڕوات. هەنارم هاتەوە یاد. فیداکاریی هەنار بۆ من و ئەفسانە وایکرد بەوپەڕی ڕێزەوە یارمەتیی تەهمینە بدەم. قاچاخچییەکە دووجار بۆمان دەگەڕێتەوە و لە تاریکاییدا پەلاماری تەهمینە دەدات. تەهمینە خۆی ناداتە دەست. جاری یەکەم لە من دوور دەکەوێتەوە و خۆی بە باوەشی توورەجدا دەکات. هەست دەکەم قاچاخچییەکە لە توورەج ناپرینگێتەوە. بۆ جاری دووەم تەهمینە یەکجێ خۆی بە باوەشی مندا دەکات. باوەشی پێدا دەکەم. قاچاخچییەکە لەبەر دەممان دەگەڕێتەوە. توورەج شان بە شانم دەڕوات. تەهمینە بە خۆمەوە دەگوشم. هەستدەکەم مامانم لەباوەش گرتووە. ڕێک ئەو کاتەم هاتەوە یاد ئاخرین جار مامان لە پرسەی ئاغامدا لەباوەشی گرتم. دیارە تەهمینە هەست بەم پاکیەم دەکات و توورەجیش لە جووڵەی تەهمینەوە بەم ئاکامە گەیشت. لەمەودوا تەهمینە دەستێکی لە کەمەری من و ئەوی دیکە ئاڵقەی کەمەری توورەج دەکات. دوو ئەفغانییەکە وەک نەبای هاتبێت و نە باران، ڕێگەیان گرتووەتە بەر. قاچاخچییەکە دوای ئەوەی هەستی کرد من و توورەج وەک سەگی باش



ناهێڵین گورگ مەڕەکە ببات، تێشگەیشت تەهمینەش کەیفی بەم ئاکارانە نایەت، لە چیا ئەستەمەکە دایبەزاندینەوە خوار و کەوتینە سەر ڕاستە ڕێگەیەک. ڕەنگبوو ئەگەر تەهمینە بەڕووی قاچاخچییەکەدا پێکەنیبا، ئەوەندی دیکە ئێمەی لەم چیابەرزە دا گێڕابا و لە شوێنێکی دووردەست تەهمینەی لێ دزیبابین. لێرەدا خۆم پێ نەوەستا و لەگەڵ تەهمینە کەوتمە قسە.

– باش لەدەست ئەم قاچاخچییە رزگارت کردین، ئەگەر رووت پێدابایە، لەبەر تۆ تا بەیانی لەم چیاوچۆڵانەی دەگێڕاین.

تەهمینە تەنیا بە پێکەنینێکی کورت وەڵامی دایەوە. لە تاریکیدا بە هۆی کورتە هەناسەکەی زانیم پێکەنیوە. لە جیاتی ئەو توورەج گوتی:

– تۆ زۆر بەڕێزی، لەم سەفەرەدا زۆر یارمەتیدەرمان بووی، ئەگەر لە جیات تۆ لەگەڵ یەکیدیکە هاوسەفەر باین خوا دەزانێ چیمان بەسەر دەهات.

تەهمینە بەدوای توورەجدا وەدەنگ هات:

– سوپاس بۆ تۆ ئاغا رەزای موحتەڕەم، ئەمما من هەروا ترس و دڵەڕاوکێم زیاتر دەبێت.

قاچاخچییەکە لە فارسی گوتنەکەمان تێنەدەگەیشت، بەڵام بە تەواوی هەستی بە یەک دەنگی و یەک هەڵوێستیمان کرد، هەر بۆیەش لێمان هاتە دەنگ و گوتی:

– شەوانە لەم دەوروبەرانە سەربازە تورکەکان هەست رادەگرن، باشترە بێدەنگ بەرێگەدا برۆن.

دوای ئەوەی نزیکەی دوو سەعاتێک بەپێ ڕۆیشتین، لە پەسیوێک داینان. رایسپاردین لە جێگەی خۆمان نەجووڵێین. ماوەیەک ونبوو و دوایی گەڕایەوە. ئەمجار وەدوای خۆی داین. لە سیلەچیایەک لێهاڵاینەوە و بەسەر رووناکایی گوندێکدا کەوتین. بۆ حەوشێکی گەورە پێشمان

کەوت. خۆی دەروازەی حەوشەکەی کردەوە و تێیگەیاندین بێدەنگ بەدوایدا بڕۆین. وەژوور دیوەخانێکی گەورە کەوتین. خانەخوێ جلی کوردی لەبەردابوو و جامانەیەکی ڕەشوسپی لە سەری هاڵاندبوو. بەخێری هێناین و کەمێک دواتر ژنێک وەژوور کەوت. بانگی تەهمینەی کرد. ژنەم تێگەیاند، تەهمینە کوردی نازانێت. ئەو تەهمینەی لەگەڵ خۆیدا برد. کابرای خانەخوێ دەستی بە قسە کرد. توورەجم تێگەیاند، ئەم ماڵە جێگەی مەترسی نییە. خانەخوێکە دوای ئەوەی زانی لەنێویاندا تەنیا من کوردم، لەگەڵمدا کەوتە قسەکردن. پرسیاری ئەودیوی لێدەکردم.

– ل هندور ئیرانێ ل دەڤەرا گەوەڕ و مەرگەوەر و ئورمیێ ناسیارێت مە گەلەک هەنە.

دەنگی زۆر وەک دەنگی مام تاهیر دەچوو. ئەوەندەی نەمابوو پرسیاری مام تاهیری لێبکەم، ئاخۆ خزمی یەکتری نین؟

ئەو ئێوارەیە کە لەگەڵ کابرای دووکاندار، ئەمجارەیان سواری ماشێنەکەی مام بارام بووین و بەرەو گوند وەڕێ کەوتین. لەڕێگادا کەس لەخۆوە قسەی نەدەکرد. پرسیارمان لە مام بارام دەکرد و ئەویش وەڵامی دەداینەوە. مام بارام گوتی، ئەمشەو میوانی مام تاهیرین.

– کاکە ڕەزا، تا ئێستا مام تاهیرت نەدیوە؟

– نەخێر پێموابی بە خزمەتی نەگەیشتووم.

شۆفیرەکە گوتی: با، دیتوویەتی. شەوێک لەمیوانداریيەکی دیکە مام تاهیریش لەوێ بوو، بەڵام قسەی نەکرد. ئەوشەوەی کەمێک باسی سەردەمی حکوومەتی موسەدیق و کودیتای ٢٨ی گەلاوێژ و سوپاهیانی دانیشتان دەکرد، مام تاهیریش لەوێ بوو.

ئەمجارە نەچووینەوە گوندەکەی پێشوو. بە تەنیشت دارسێو و مەزرای وێنجە و چەند باغی چنار و سپیداردا کەمێک بەرەو بەرزایی سەرکەوتین و گەیشتینە گوندێکی بڵاو. ماڵەکانی کەمێک لە یەکتری



دووربوون. مام تاهیرم ناسییەوە. ڕاستە، ئەوشەوە ئەویش لەوێ بوو. بەڵام کەم قسەی کرد.

مام تاهیر لەبەر دەرگا فەرمووی لێمان کرد و بەرەو دیوەخانێکی گەورە ڕێنوێنیی کردین. دیوەخانەکە ئەوەندە گەورەبوو، لەنێوەندیدا دووستوونی ئاسنی وەبەر درابوون. سەیرە ئەو دیوەخانەی ئێستا لەگەڵ توورەج و بورهانەدین و تەیموور تێیدا دانیشتووین، زۆر وەک ماڵی مام تاهیر دەچێت. بەڵام ئێمە لەوێ میوان کرابووین و لێرە سەربەخۆ وەژوور کەوتووین. لەوێ دەمزانی دوای دانیشتنەکە دەچمەوە لای ئەفسانە و لێرە نازانم چارەنووس بەرەو کوێم دەبات. دیسان بۆ ماوەیەک ئەو ترسەم ڕێنیشت نەکا بە دەردی فەرماندە قژ ماشوبرنجییەکەی ئامانج بچم و ئاووگڵ بمسووڕێنێت و بە گۆڕغەریبی سەربنێمەوە.

لە ماڵی مام تاهیر دوای شیو خواردن دەست بە قسەو باس کرا. من لەو دانیشتنانە ڕاهاتبووم. هەمووجارێک باسوخواسی ئەم کۆبوونەوانەم بۆ تۆ دەگێڕایەوە و تۆش بۆ جاری داهاتوو ڕێنوێنیت دەکردم.

ئەم کۆبوونەوانە و کتێبەکانی کتێبخانەکەی تۆ منیان هەڵوەشاند و دەبەریەکیان هەڵکێشامەوە. بەڵام هەمووی لەسایەی تۆوە بوو. تۆ فێرت کردم بزانم خۆشەویستی چییە. تۆ فێرت کردم بە کوردییەکی ڕەوان و پاراو قسەبکەم و بنووسم. تۆ فێرت کردم هەموو ژن و کچێکی جوان وەک ئەفسانە ببینم و تەنیا دڵ بدەم بە ئەفسانەیەک.

تۆ فێرت کردم لەگەڵ هەناردا بێئەوەی خۆشەویستیی دڵدارانەمان لە بەیندابێت، هاوڕێی یەکتر بین. یەکەمجارە هەنارێک ببینم و دەستی لێنەدەم. ئەم هەنارە تورت و ئاودارە، ئەم هەنارە ترش و شیرینە، ئەم هەنارە مزرە، ئەم هەنارە مێوخۆشە، ئێستاشی لەگەڵدابێت نە دەستم لێدا و نە تامم کرد. هەرکام لەم تامانە لەززەتی خۆیان هەیە. ئەم هەنارە بەهەرتامێکەوە بێت، تورت و پڕ ئاوە. لە کەشێکی سازگاردا

پێگەیشتووە. هەتا بەتێرایی خۆی ئاوی هەڵنەمشتووە، دەستی لە لقی دارەکەی بەرنەداوە. لەو هەنارانە نییە بەزەبری دەرمان و لە ژوورە سارد و تاریکەکاندا بۆ وەرزی درەنگان رادەگیرێن. بەڵام تامی سێوی ئەفسانە وای لێکردووم واز لە هەموو هەنارێک بێنم. ئەو سێوەی لەسەر دەفری میوەکەی ماڵی سەفەرعەلی دەستم پێی نەگەیشت، بەڵام لە باغە ئەفسانەییەکەی گێلاساوادا پڕ بە سیەکانم بۆنم کرد و ئاوە شیرین و شەفابەخشەکەیم هەڵمژی.

هەر لەتۆش فێربووم متمانەیەکی وا لە نێوان خۆم و تەهمینە و توورەجدا دروست بکەم، توورەج بەوپەڕی دڵنیاییەوە تەهمینە بە من بسپێرێت.

ئەوکاتەی مام تاهیر بەرەو دیوەخان رێنوێنی دەکردین، دڵم بە چەخماخەی ئەو هەورانە خۆش بوو کە لە نزیک لووتکەی چیاکانەوە مژدەی بارانیان پێبوو. دوای بارانە هەوا شێدارەکەی شاری گێلاساوا ئەوەندەی دیکە خۆش دەبوو.

ئەوانەی دەیانناسیم و ئەوانەی ئێستا دەمناسن هەر بە رەزا بیژوو یان رەزا عەجەم ناوم دێنن. تۆ دەزانی نە بیژووم و نە عەجەمیشم. دەشزانم بۆ دڵخۆشیی خۆم پێم دەڵێی تۆ کوڕی هەوری. بەڵام لەو کاتەوە تۆ گوتووتە کوڕی هەوری. پێمخۆشە گەواڵە هەورەکان بەردەوام بەسەرمەوە بن. هەست دەکەم لەو ساتانەدا لە نوێ لەدایک دەبمەوە.

شاری گێلاساوا ئەمساڵ دەڵێی نێوەندی سەرهەڵدانی بروسکە و هەورەتریشقەیە. رەنگە هەموو شوێنێک وابێت، بەڵام من لێرە زیاتر هەست بە دەنگی هەور و چەخماخەی ئاگر و بۆنی باران دەکەم. رەنگە ئەویش هەر خەتای ئەفسانە بێت. ئەفسانە بوو یەکەمجار گوتی تۆ کوڕی هەوری. من لێرە زیاتر بیر لە هەور و بروسکە و شریخە و باران دەکەمەوە.ئەوە چەندین ساڵە دوو وشەی «بلۆت» و «ئۆغلوو»



بە شوناسنامەکەمەوەن، تا ئێستا بیرم لەوە نەکردووەتەوە بڵێم، کوڕی هەورم. جاران لە تەورێز لە شەبەقی لەناکاو و گرمەی بەسامی هەورەتریشقە دەترسام. پێش ئەوەی دەنگی هەورەتریشقە بێت، کاتێک چەخماخەکەیم دەدیت، ترسێکی لە ناکاو دایدەگرتم. لە مەودای نێوان گەیشتنی نوور و دەنگدا خۆم لە پەسیوێکدا مەڵاس دەکرد. لە گێلاساوا هەمیشە هەورە ئاوسەکان لەدەوری کێوەبەرزەکانی سێسنووردا کۆ دەبنەوە. ئەو سێ سنوورەی ئێران و ئێراق و تورکیا پێک دەگەیەنێت، کۆمەڵە کێوێکی بەرزی سەر بەکۆمەڵەکێوی زاگرۆسن ولە نێوان ئێران و ئێراق و تورکیادا سەریان بەرز کردووەتەوە. ئێستا دەزانم ئەگەر لەوشوێنەڕا بە سنوورە دەستکردەکەی نێوان ئێران و ئێراقدا بگەڕێی، رێک دەگەیە قەندیلەکەی ئامانج و ئەفسانە و دایە مەرجان. ئەو کاتەی ئەفسانە باسی قەندیلی بۆدەکردم، زیاتر خووم دایە سەر جوغرافیا. لە بەشێکی کتێبەکەدا باسی ئەم بایانەی دەکرد کە لە سەر دەریای نێوەڕاستەوە دێن و باوەشباوەش هەور و بارانیان پێوەیە.

«با هەورەکان لە سەر دەریای نێوەڕاستەوە بەرەو رۆژهەڵات دەبات. تورکیا و بەشێک لە سوریا و بەشێک لە باکووری ئێراق و بەشێکیش لەخاکی ئێرانی پێ پاراو دەبێت».

هەورە رەشە قورسەکان پڕ لە بارانن. لە ژێر تەوژمی ئەو بایەی لە رۆژئاواوە لە سەر دەریای نێوەڕاستەوە دێت، بەشێکی زۆریان بە دیوی رۆژهەڵاتدا خۆیان لە پەنا کێوەبەرزەکانی سێسنووردا گل دەدەنەوە. هەتا دێت بارستایی هەورەکان زیاد دەبێت. لەپاڵ یەکتردا جێگەیان نابێتەوە. بە ئەملاو ئەولای کێوەکەی پشت شاری گێلاساوادا بە چەخماخەلێدان و گرم وهۆڕ بە سەر دەشتاییەکەدا بڵاو دەبنەوە. رەزای کوڕی هەور، گومان لەوەدانییە تۆ لەم ناوچەیەدا لەدایک بوویە، بەڵام نازانی لەگەڵ شریقژنی هەورەکاندا چۆن یەکەمجارچاوت کردووەتەوە.

ئەم بروسکانە بۆ ئەوا دەکەن؟ وردەوردە نزیک دەبنەوە. پەنجەرە ڕەشەکانی دیوەخانی مام تاهیر هەموو بروسکە دوور و نزیکەکانیان پێوە دیارە. هەر کەس لە ئاست خۆیەوە هەڵدەستێتەوە و پەنجەرەکەی نزیک خۆی بە پەردەکان دادەپۆشێت. برووسکەکان نزیک دەبنەوە. چەخماخەی هەورەکان بە نێوان تانوپۆی پەردەکاندا تێدەپەڕن. هێندێکجار شەبەقیان بەسەر نووری گڵۆپەکاندا زاڵ دەبێت ونێو تاک تاکەی دەفر و تەنانەت نێو کەوچکەکانی دەستی میوانانیش رووناکتر دەکەنەوە. لەم ساتەدا من پێچەوانەی هەموو میوانەکان هیچ ترسێک هەڵینەگرتووم. ڕەنگە هیچ ژەمێک ئەوەندەم نەخواردبێت. دەڵێی لەگەڵ شەبەقی برووسکەکان و شریخەی هەورەکاندا گەدەم لەبەریەک دەکشێتەوە. هەر دەخۆم و زیاتر هەست بە برسییەتی دەکەم. تامی خۆشی شیوەکەی سەر خوانی مام تاهیر دەڵێی مەززەی خواردنەوەی باران و هەور و برووسکە و شریخەیە. هەتا بارانەکە زیاتر دایدەداتێ، من لە خواردنی مەززەکە خێراتر دەبم. باران سەرخۆشی کردووم و پێکی برووسکە و شریخەشی بەسەردا دەکەم. دەڵێی ئەمجار گرتوومی و هەست بە سووکبوون دەکەم. دەڵێی کێش و قورساییم بووەتەوە هیچ. هەڵدەفڕم. بەنێو هەورەکاندا دەڕۆم. لە ئاکامی خوشینی هەورەکان بە سەر یەکتردا، دەبمە بروسکە و تاریکییە ترسناکەکە رووناک دەکەمەوە. بە خێرایی لەگەڵ چەخماخەیەکدا دەبمەوە بە ئاگر و خۆم بە زەویدا دەکەم. بە سەرمەقولاتلێدان بەنێو باغ و مێرگەکاندا دەڕۆم و بەسەر سەربانە بەرز و نەوییەکانی شاری گێلاساوادا باز دەدەم. لە باوەشی ئەفسانەدا دەکووژێمەوە. مەترسە ئەفسانە، من لەجنسی ئاگرم، بەڵام تۆم پێناسووتێت.جارانی دیکەش بە چەخماخەلێدان دێمەوە. ئەم کووژانەوەیەم کاتییە، هەتا هەناسەیەک بەسەر دەریادا راببرێت، هەور دروست دەبێت. هەتا هەوریش هەبێت، باران دەبارێت. زۆر زەحمەتە



هەور لە ژیانی خۆیدا چەخماخە لێنەدات و نەشریخێنێت. شریخە و چەخماخەی هەور بارانی لێوەدەبارێت. چەخماخە و باران سەرچاوەی وزەن. چەخماخە و باران ئاوەڵدووانەی منن. پێکەوە لەدایک دەبینەوە، بۆیە دەڵێم دێمەوە. هەتا هەور و بروسکە و شریخە هەبێت، منیش هەر دێمەوە. هەر دێمەوە ڕۆژێ لە ڕۆژان نا هەموو ڕۆژێ. هاتنەوەی چی؟ من دەکووژێمەوە و دادەگیرسێمەوە.

بمرە رەزای بڵوت ئۆغڵوو، بمرە... بۆ وات بەسەر خۆت هێنا؟ بۆ ئەوەندە خۆت فشکردەوە و گوتت، کوڕی هەورم و شێر بە گوێیان دەگرم و شیرم هەوران دادێنێت؟ ئەدی کوا ئەو هەموو هەرەشە و گوڕەشەیەت؟ کوا ئەو هەموو خۆفشکردنەت؟ ئەدی بۆ مام تاهیرت بەجێ هێشت؟ خۆ قەت ناتوانی وەڵامی چاکەی هەنار بدەیەوە. دەزانی چیت کرد، رەزا؟ کوا مەش بایرام؟ بڵێی ئەفسانەی کچی بیر لەو نامەیە نەکاتەوە بۆی خستیە نێو قەڵشتی مۆبڵەکەوە؟ ئەدی مامان دەبێ ئێستا چیبکات؟ بڵێی لەو قسانەی لە ئاشپەزخانە بەڕووی تۆ و ئاغاتدا کردی، پەشیمان نەبووبێتەوە؟ بڵێی مامان خەمی تۆی بێت؟ یان ئێستا بیوەمێردێکی دیتووەتەوە و لەوپەڕی فەرامۆشکردنی مەش سەفەرعەلیدا بە زگە زلەکەی خۆی پێبکەنێت و لێکدالێکدا بۆ ئاگاداربوون لە دۆخی منداڵدانی، سەر لە پزیشک و مامایان بدات؟

وابزانم لەمن بەدەر، ئەوانی دیکە بەترسەوە نانیان خوارد. دوای سفرە کۆکردنەوە، مامتاهیر کە بۆ دەستشوشتن ڕۆیشتبووە دەرەوە، گەڕایەوە.

– ماشەڵڵا، بارانەک خوەش بوو. گەواڵە هەورەکێ ب بەرەکەت بوو. بارانەکێ باش بوو، بەلێ با دگەل خوەدا ژێردا بر.

گەواڵە هەور ئەم شەونشینییەی لێ شێواندین. وێدەچوو ئەمشەو باسەکە هەر لەدەوری هەور و باران و دەغڵ و دان و چەخماخە و

هەورەتریشقەدا بخولێتەوە. هەستم کرد ئەم هەوروبارانە لیمانی تێکدا. بۆمان ناکرێت باسێک دابمەزرێنین و سوود لە ئەزموونەکانی مام بارام و مام تاهیر وەربگرین. من ئەوکاتە لەخەیاڵی ئەفسانە و بولۆتئۆغلووودا بووم. هاتمەوە سەرخۆ. پێم ناخۆش بوو ئەم هەورەتریشقەیەی ئەمشەو خواردنی لە دۆستان تێکدا و ڕەنگە هەیمەنەی بەسەر هەموو ئەو پرسیارانەماندا زاڵ بوویێت کە بەتەمابووین لەم دوو پیرە خاوەنئەزموونەی مەجلیسەکەمانی بکەین. ئەم دوو پیاوە، دەڵێی قامووس و کتێبی سەرچاوەن. وەڵامی هەموو پرسیارێکیان پێیە. دیارە کتێب سەرچاوەی هەموو زانیاری و تێگەیشتن و لێحاڵیبوونێکە، ئەم دوو پیاوە، لەنێو کۆمەڵی بێکتێبدا، سەرچاوەی هەرە بەکەڵکن. هەزاران لاپەڕەیان لە سینگی خۆیاندا حەشار داوە. ئەوانە هەرە خۆشەویستی ئەو خەڵکە تەنبەڵەن کە بە خوێندنەوەی دوو دێڕ ژانەسەر دەیانگرێت و تەنیا چاو لە قەبارەی ئەستووری کتێبەکان دەکەن و هەمیشە خوێندنەوەیان بەکەسانی دیکە دەسپێرن وزۆرجار ئەوانیش هەر ڕێچکەی کتێب نەخوێنەکان دەگرنەبەر. لەنێو کتێبی دەروونی ئەم دوو پیرەپیاوەدا، هەر ئەوەندەیە سەر بەلاپەڕەیەکدا بکەی. ئەم لاپەڕەیە ئەوەندە پەڕاوێزی بۆ هەڵبەستراوە و ئەوەندە نیشانەی بۆ لەسەر وشە و کۆتایی ڕستەکاندا داندراوە، مەپرسە. هەموو ئەو پەڕاوێز و نیشانانە هانت دەدەن بە دوای کتێب و سەرچاوەی دیکەدا بڕۆی و ئەسپی خولیا و تینووی زانین و فێربوون بەنێو لاپەڕەکاندا هەلینگ بدەی. هەمیشە دوای فەرمایشتی ئەم بەڕێزانە، ئەسپی تینووی من بەرەو ئەفسانە قەڵەمباز داوێت. کاتێک هەوساری لێ توندەدەکەم، چەنگان لە ئاسمان دەدات و پڕ بەهاوار و تاسەی فێرخوازانەی دەحیلێنێت. ئەفسانەش جڵەوی دەگرێت و بەرەو کتێبخانەکەی وەریدەسووڕێنێت. منیش لە شەرمی وێنەکەی ئامانج کە لەژێر تۆڕە تەنکەکەوە سەیرم دەکات، بە هەستیارییەوە بەنێو کتێبەکاندا



دەگەڕێم. دەترسێم ئامانج لەپشت ئەم تۆڕە تەنکەوە لێم وەخۆکەوێت و سەرکۆنەم بکات.

«کاک نا ڕەزا، بۆ ئەوا تەنبەڵی؟ بۆ ناخوێنییەوە؟ من ئەگەر ئەوا لەپشت ئەم تۆڕە تەنکە وشک هەڵنەهاتبام، ڕەنگە چەندین ئەوەندی کتێبی نێو ئەم کتێبخانەیەی ئەفسانەم خوێندبایەوە. پێم خۆش نەبوو بەم دەردە بچم. پێم خۆش نەبوو لە ژێر ئەم پەردە تەنکەوە خدر لە باوەشی مەرجاندا ببینم. پێم خۆش نەبوو دوای نەمانی خدریش چەند کەسی چاوحیز بە یەک چاو سەیری ئەفسانە و دایکی بکەن. بەڵام تۆ تەخت بۆی دانیشە. ئەوەندەی بۆت دەکرێ بخوێنەوە. من بە ناچاری لە ئەفسانە دابڕام، بەڵام دڵنیام تۆ بە دڵ ئەفسانەت دەوێت و ئەفسانەش گیرۆدەی تۆیە. بخوێنەوە، ڕەزا. تەنبەڵ مەبە، بخوێنەوە! ئەو چەند ساڵەی لەم شارەش دوور بووی تێهەڵبێنەوە».

مام تاهیر چاوێکی بە مەجلیسەکەدا گێڕا. بێدەنگی بەسەر هەمووواندا زاڵ بوو. وەک جارانی دیکە چاوەڕوان بوون مام بارام یان ڕەنگە مام تاهیر وەدەنگ بێت و لەسەر بابەتێک بدوێت، یان یەکێک لەنێو مەجلیسەکەدا بە پرسیارێک بێدەنگییەکە بشکێنێت. مام تاهیر وەک خانەخوێ هەستی کرد دەبێ بە جۆرێک مەجلیسەکە وەخۆ بخاتەوە.

– ئەڤ بارانە نزیکی ٤٠ سال بەری نها بیرا من ئانی. گەلەک نەبوو ئەم هاتبوونە وێ بناری. پشتی زێدە بووناترسێ هیرشا ئنگلیزان لە ئیراقێ، ئاودیوی ئێرە بووین. بخۆ لوی گوندێ ڤەگیرساین. سەردەمێ حوکمێ ئاغاوەتان بوو. پێشی هنگێ جارەک دی کو ئەز بچووک بووم، دگەل داک و بابێ خوە هاتبوومە دیوا ئیرانێ. هەر لبەر هندێ من سجیلێ ئیرانی هەبوو. بەلێ مە خزمەک هەبوو، ناڤی وی میرۆ بوو. باڤێ میرۆی ب ئەسل خەلکێ دەرسیمێ بوو. دگەل جەماعەتێ سەید رەزایێ رەحمەتی ل کۆمکوژیێ دەرسیمێدا، ژ ئالیێ حکوومەتێ ترکانرە هاتبوو کوشتن. میرۆ

ژی دهێتە کوردستانا عێراقێ و بخۆ ل دەڤەرا نزیک تخوبێ ئیرانێ شڤانی و پەزڤانیە دکەت. ژنا میرۆی خزما مەبوو. پشتی هێرشا ئنگلیزا بۆ وێ دەڤەرێ، میرۆ ژی پەنا ئانیە ڤێ گوندی. میرۆ بخۆ شڤان بوو، دەچووە لالێ پەزێت خەلکی. پارچە عەردێکێ باش ژی ژ ئاغایێ وەرگرتبوو و بخۆ شۆل لسەر دکر. ل وی دەمیدا، شاهێ ئیرانێ دەست دا ئسلاحاتا ئەرزی و هەرکەس عەردێ ئاغای لبن دەستدابوو، لسەر فەرمانا شای دەست ب سەر وی عەردیدا گرت. بەلێ میرۆ هەویە و شوناسنامەیا ئیرانی نەبوون. کەسەک کو لە ئیدارا ئیسلاحاتا ئەرزی شۆل دکر و ترکێ ئازەری بوو، ب رازیبوونا میرۆی عەردێ وی بناڤێ خوە کر.

ئەوە چییە رەزا؟! دەی دەی، سەر و چاو و تەنانەت کونە لووتیشت بکە بە گوێچکە! مەهێڵە ئەمشەو مام تاهیر بێدەنگ بێت، رەزا. دیتتەوە، دۆزیتەوە! بزانە ئەفسانە چی لێکردی؟ هەتا ڕەگ و بنەچەکی مام میرۆ دەرنەیەنی، نەکەی بوەستی! مام تاهیر سەرچاوەی هەموو زانیارییەکانە. ئەوە چۆن بوو مام تاهیرت دیتەوە؟ ئای لەو بارانەی رەحمەتە ئەمشەو بەسەرماندا باری! ئەگەر ئەم باران و هەورەتریشقەیە نەبوایەن، چۆن مام تاهیر دەچووە سەر ژیانی مام میرۆ؟ ئەوە چ دەکەی رەزا؟ ئاگات لە خۆت بێت، هۆشت نەڕوات. هەموو قسەکانی مام تاهیر مووبەموو و پیت بە پیت تۆمار بکە. تەنانەت زاراوە تێکەڵەکەی مام تاهیریشت لە بیر نەچێت. ئێستا ئەگەر ئاغا سەفەرعەلیی بولۆتئۆغلوو مابا، چۆن شاهیدی دەدا؟ مەهێڵە باسەکەی ئەمشەوی مەجلیس بگۆڕدرێت، پرسیار لە مام تاهیر بکە، بەڵکو ئەم گرێپووچکەیەت بۆ هەمیشە بۆ ببێتەوە.

– مام تاهیر ببوورە، ئەم گێڕانەوەی جەنابت چ پەیوەندییەکی بەم بارانەوە هەیە؟

– کوڕەتە سەبر هەبیت. بەسەرهاتێ میرۆی گرێدایێ باران و عەڤرانە. زارۆک د زگێ ژنا میرۆی دابوو. د ڕۆژەکا بوهارێدا میرۆ دگەل ژنکا



خوە چووبوو چیای دا هندەک گیا و کولیلکا بینن. ژانا پەیدابوونا زارۆکی دهێتە ژنکا میرۆی. میرۆ ژنکا خوە دکشینە بن کەڤرەکی. زارۆک ژ دایک دبیت و بریسیەک ل کەڤری ددەت و بەرەک ل کەڤریڤە ب سەری ژنکا میرۆی دکەڤیت. ژنک دمریت. هندەک ژی دبێژن ژنا میرۆی ل ترسا دەنگێ عەڤرا مریە و چ بەر سەرێ وی نەکەتینە.

میرۆ زاروییێ ل ناڤ کراسا ژنا خوەدا دگەهینیتە مال. خەلکی گوندی تەرمێ ژنکا میرۆی هاڤێتە سەر ملێ خوە و ئانیە مزگەڤتێ و هاتە بن ئاخ کرن.

میرۆ زارۆکی دا دەست ژنکێن گوندی و هەمی ژنێن ڤی گوندی ژی بێتەخسیر شیر دانە زارۆکی. من کوڕێ میرۆی ناڤ نا رەزا. باڤ وکالێ ڤی هەڤخەباتێ سەید رەزاییێ دەرسیمی بوون.

گوێبگرە ئەی رەزای بلۆتئۆغلوو. گوێ بگرە ئیزا بیژی، ئەی رەزا عەجەم. تۆ لە سەفەرعەلی و تایفە و تۆرەمەکەشی بلۆتئۆغلووتری. ئەی رەزای کوڕی هەور، نەکەی، مام تاهیر بەرنەدەی! هەموو زانیارییەکان لەمام تاهیر وەربگرە، بەڵام پەلە مەکە و خۆتی پێ مەناسێنە. ئەگەر بتناسێتەوە، ڕەنگە وازت لێ نەهێنێت و بتهێنێتەوە ئەم گوندە. دەی جا چ دەبێت، با بتهێنێتەوە. ئەی هەمیشە حەسرەت و ئارەزووی تۆئەوە نەبوو ئەم گوندە بدۆزییەوە و لەوێ بەوردی بەدوای سەرەداوای ژیانی رابردووتدا بگەڕێی؟

– ئەدی مام تاهیر، پاشان منداڵەکە گەورە بوو؟

– بەڵی، زارۆک، زوو گەورە بوو، ژنکین گوندی حەمی ئاگەهداری وی بوون. کوڕێ میرۆی گەهشتە سنێ پێنج سالی. حوکمەتێ ئیرانێ سوپا دانیشەک بۆ مە هەنارت. کوڕێ میرۆی ژی وەکە هەمی زارۆکین دن چو بەر خوەندنێ. کورەکی گەلەک زیرەک بوو. بەلێ ئەوی چ شوناسنامە و سجیل نەبوون. سوپا دانشی کو خەڵکێ تەبریزێ بوو، بناڤێ خوە

شوناسنامە بو چێکر و ئەو کرە کورێ خوە. پشتی دوو سالان حوکمێ سوپای تەواو بوو. ئەوی کورێ میرۆی ژی دگەل خوە بر. ڤێ‌دەمی ئینقلابا مەلایان ل ئێرانی دەست پێکر. لبەر شەرێ حوکمەتی و کوردان، میرۆ و کورێ وی نەشیان هەڤودوو ببین. پشتی چەند سالان خەبەر هات رەزا لە جەبهەیا شەرێ ئیران و ئێراقێ هاتیە کوشتن. میرۆ ژی پشتی نەمانا کورێ خوە، نەخۆش کەت و پشتی هەیامەکێ کێم ئەو ژی چوو بەر رەحمەتا خودێ.

– ئەدی زەمینەکەی چی لێهاتەوە؟

– پشتی مرنا میرۆی ئەوکەس کو عەردێ میرۆی بناڤێ خوە کربوو، دەست بسەر ڤێ عەردی داگرت و نها پشکەک کریە رەز و پشکەک ژی باغێ سێڤایە.

* * *

بەباشی گوێم لە کابرای خانەخوێ نەبوو. ئەگەر ئەو قسەی دەکرد زیاتر دەم‌ولێو و شێوازی قسەکردنی مام تاهیرم دەهاتەوە یاد. ئەو زیاتر باسی ئەو خزمانەی دەکرد لەکاتی سەرهەڵدانە پەیتاپەیتاکانی کوردستانی تورکیادا بەرەو دیوی ئێران چووبوون. منیش خولیای دەسکەوتی زیاتر، سەبارەت بە سەرهەڵدانەکەی شێخ رەزا پرسیارم دەکرد. تەنیا کاتێک قاچاخچییەکە باسی تونجەلیی کرد، ئەو توورە بوو. گوتی چما دبێژیە دەرسیمێ تونجەلی؟

تا ئێستا ئەوەی لەبارەی دەرسیمەوە دەیزانم، تەنیا هەر قسەکانی مام بارامە. بەداخەوە کتێبخانەکەی تۆش مێژووی راپەڕینی دەرسیمی زۆر بە کورتی تێدا بوو. دوای ئەوەی مام تاهیر بەسەرهاتی هەڵوەشانەوەی ژیانی مام میرۆی کرد، مام بارام ئاوا باسی شۆڕشەکەی سەید رەزای کرد:

– دەرسیم لە دوای چارەگی یەکەمی سەدەی بیستەمدا یەکێک لە نێوەندەکانی بزووتنەوەی کوردستانی تورکیا بوو. دەوڵەتی تورکیا



لەوسالانەدا دەرسیمی گەمارۆدا. وەک دەگێڕنەوە، دەوڵەت داوای لە خەڵک کرد ٢٠٠ پارچە چەک تەحویلی حکوومەت بدەن. لەو سەروبەندەدا کوڕێکی سەید رەزای دەرسیمی کە بۆ وتوویژ دەچێتە لای حکوومەت، بە دەستی حکوومەت و بە دەستکیسیی عەشیرەتەکانی سەر بە دەوڵەت دەکوژرێت. دەڵێن حکومەت لە شەڕی دژی خەڵکی دەرسیمدا یارمەتیی خائینان دەستی بە ڕەشەکوژی کرد. کابرایەکی زانا و شاعیر و نووسەر بە ناوی عەلی شێر کە زۆر لە سەیدرەزا نزیک بوو، بەدەست برازایەکی سەید رەزا کوژرا کە بە نهێنی ببوو بە پیاوی تورکان. ئەم خەبات و سەرهەڵدانە دوو ساڵی نەخایاند کە سەید رەزا و هاوڕێیان بەدەستی تورکان لە خاک و خوێن گەوزین. سەید رەزا لە کاتی لەداردانیدا گوتبووی: «من ٥٧ساڵم و دەچمە نێو ڕیزی شەهیدانی کوردستان. دەرسیم شکا، بەڵام کوردوکوردستان هەر بە زیندوویی دەمێنێتەوە. لاوانی کورد باش دەزانن چۆن تۆڵەمان بستێننەوە». دوای ئەوە بەشی هەرەزۆری خەڵکی دەرسیمیان لە ئەشکەوتەکاندا زیندانی کرد و پاشان بە دووکەڵ قانگیان دان و خنکاندیانن.

پاش بەدرۆ دەرچوونی بەڵێنیەکانی مستەفا کەماڵ پاشا، کوردەکان لە چەند شوێنێک دەستیان بە خەبات کرد و لە ئاکامدا سەرکوت کران. ئیحسان نووری پاشا بە زۆرەملی نێردرایە تاران و لەوێ لە ڕووداوێکی گوماناویدا گیانی لەدەستدا. سەید رەزاو هاوڕێیانی تووشی ئەو کۆمەڵکوژییە گەورەیە بوون. بنەماڵەی نەهرێ و بەدرخانییەکان ناچار بوون زێدی خۆیان بەجێ بهێڵن. خەڵکێکی زۆریش ئاوارەی ئێراق و ئێران بوون کە پێیان دەڵێن موهاجیر. هەر ئەم مام تاهیرەی خۆمان و ئەو مام میرۆیەی ئێستا مام تاهیر باسی کرد، لەو موهاجیرانەن.

من کە لەگەڵ لێقەوماوانی دوای تێکشکانی حکوومەتی موسەدیق بووم موهاجیرەکانی کوردستانی تورکیا و تەنانەت چەند جار کوردەکانی

کوردستانی عێراقیش لەم گێلاساوایەدا گەیشتووینەتەوە یەکتر. ئەوە ئێستا دەبینن من و مام تاهیر پێکەوە باسی رابردووتان بۆ دەکەین و بەشێک لە مێژووتان بۆ دەگێڕینەوە.

مام بارام ئەم مێژوویەی ئەوەندە بەچڕی بۆ گێڕاینەوە، ناچار بووم، بەدوای چەندین کتێبدا بگەڕێم تا بە زانیاریی تەواو بگەم.

* * *

تووورەج ئارامی لێ هەڵگیراوە. کاتێک قاچاخچییەکە لە دیوەخان دەردەچێت، توورەج هەر چاوی لەو دەرگایەیە کە ژنەکە تەهمینەی پێدا بردە ژوور. ئەم دەرگایە لەبەر رووناکیی حەوشەکە دیارە و قاچاخچییەکە روو لەوێ ناکات.

من وای بۆ دەچم ئەم پیاوە لە ناچاری رووی کردبێتە ئەم بەرو دیوەخانە. وێناچێت ئەم ماڵە ماڵێکی بێڕێز و خراپ بن. ڕەنگە توورەجیش ئەوە لە روانینی من و رووخۆشیی خانەخوێدا بخوێنێتەوە. تەیموور و بورهانەدین دەڵێی بیبارێکی زۆریان خواردووە و تازە لە ئاودەست گەڕاونەتەوە. قونیان ڕەمافوورەکە دەخشێنن. دیارە بەپەلەن و ئێستاش دەترسن بەرەو ئێران و لەوێوەش بەرەو کابولە وێرانەکە گل بدرێنەوە.

قاچاخچییەکە روو لە من دەکات و دەڵێت، پێویستە ئەو ژنەی لەگەڵتانە بەتەواوی خۆی بگۆڕێت. بە جلەکانیەوە پێیەوە دیار نەبێت خەڵکی ئێرە نییە. مامەی خانەخوێ بە قاچاخچییەکە دەڵێت، بچۆ ژنەکان ئاگەدار بکەوەبا تەهمینە جلەکانی بگۆڕێت. قاچاخچییەکە هەستی بە نیزوکایەتی من و تەهمینە کردووە و دەیهەوێت لێرە لای ئێمە خۆی شیرین بکات. بەمن دەڵێت، تۆ هەستە بچۆ. دەچم تەهمینە تێدەگەیەنم دوای ئەوەی خۆی گۆڕی، ئامادەبێت، ماشێن بەدواماندا دێت.

تەهمینە وەژوور دەکەوێت. ئەوەی پێی خۆش نییە سەیری بکات، من و توورەجین. من باش دەزانم توورەجیش چەندین ئەوەندەی



من تەهمینەی بەم جل و ئارایشتەوە پێجوانە، بەڵام هەردووکمان ترسێکمان لە دڵ نیشتبوو. من و توورەج دەترسێین چۆن تەهمینە لەم چیا وگوندانەوە بەرەو شار و ئاوەدانی بەرین. کابرای خانەخوێ بەم تەمەنەیەوە، تا کاتی ڕۆیشتنی ئێمە، دەمی وێک ناکەوێتەوە و هیچ قسەی بۆ ناکرێت. ئەو دووژنەی تەهمینەیان لەگەڵ خۆیاندا هێنایە ژووری دیوەخان، ئەوانیش دەمیان وێک ناکەوێتەوە. من هەست دەکەم لە جیاتی تەیموور و بورهانەدین شەوێلاکم دێشێت. تەهمینە بە ڕوخسارییەوە دیارە چەند ئەوەندی من و توورەج هەست بە مەترسی دەکات. وەک کۆترە باریکەیەک لە هەڵۆ ترسابێت، خۆی بە نێوان من و توورەجدا دەکات. بەپارێزەوە دەست داوێمە سەرشانی. هەستدەکەم توورەج ئەم کارەی منی پێباشە. پێموایە توورەج من بە مەحرەمی خۆی دەزانێت. بۆم ناکرێت وەک خوشکی خۆم بڕوانمە تەهمینە. بۆ ئەوەی خەیانەتم بە توورەج نەکردبێ و دڵیم نەڕەنجاندبێ، ناچارم تەهمینە بکەمەوە بە ئەفسانە. ئەفسانە خانم ئێستا تۆ بەم جلوبەرگەی تەهمینەوە لێرە بای، نە بەمن و نە توورەج و نە بە دوو کوڕە ئەفغانییەکەش نەدەپارێزرای. ئێستا دەڵێم، چاک بوو تۆ لەگەڵماندا نەبووی.

سواری ماشێنێکیان کردین. کابرای قاچاخچی هەولێدا من لەپێشەوە سواربم. توورەج و تەهمینە هەستیان کرد دەیهەوێ لێکمان دابڕێت. تەهمینە شاقەلی کراسی من دەگرێت و رامدەکێشێت. بۆ لای دەرگای دواوەی ماشێنەکەم دەبات و خێرا بەرەو ژوور پاڵم پێوەدەنێت. خۆی داوێتە تەنیشت من و توورەج بەدوای خۆیدا رادەکێشێتە نێو ماشێنەکە.

لەماوەی چەند سەعاتە ڕێگەدا تا دەگەینە ئێرە، کاتێک هەست بە گەرمیی لەشی تەهمینە لە نێوان خۆم و توورەجدا دەکەم، لێم دەبێت بە مامان و ئەوکاتەم دێتەوە یاد کە دوای گەڕانەوەم لە بەرەی شەڕی ئێران و ئێراق لەباوەشی کردم و دایکانە پێمدا نووسا. کاتێکیش بەناچاری ئاوڕ

وەلای من دەداتەوە و سەیریدەکەم، ناچارم بیکەمەوە بە ئەفسانەی خۆم.

ئەفسانەی من، لەو کاتەوە لە سووکە خەوەکە رابـووم، قەڵەم و کاغەزم پێیەو خەریکم ئەم نامەیە بنووسم، تەنیا چەند دێڕێکی کەمم بۆ ڕەشبووەتەوە. ڕەنگە ئەم پەڕە کاغەزەش بدڕێنم و نەینێرم. یان ڕەنگە بینێرم و بەدەستت نەگات. گرینگ ئەوەیە من کوڵی دڵی خۆم بەتاڵ کەم و ئەوەی لەدڵمدایە پێت بڵێم. دەزانم ئێستا تۆش لە دووریی مندا شریتی ژیانی رابردووت لێدەدەیەوە.

وردەوردە وێڕای نزیکبوونەوەی نیوەڕۆ هەورێکی ڕەش ئاسمانی داگرتووە. ڕەشەبایەکی بەهێز دار و پنچکەکانی ئەوبەر رووبارەکە نەوی دەکات. ئەگەر ئەم چیا و چۆڵە وشکانی بوایە و ئەوا دار و درەخت و شیناورد لە خۆی نەگرتبا، ئێستا لەبەر تۆزوخۆڵ، چاو چاوی نەدەدیت. بەڵام بە خۆشییەوە ئێرە سەوز و شێدارە. هـەوری ڕەشی ئاوس لە زەوی نزیک دەبنەوە. ڕەنگە شەستە بارانێکی خۆش ببارێت. نازانم بۆم دەکرێت بچمە رێکخراوی پەنابەران یان نا، هەر نازانم دەچم یان پاشگەز دەبمەوە.

تۆش ئاگاداری خۆت بە. لە کاتی هەور و بارانەدا دەرمەکەوە. ئاگات لە سکت بێت. تا لەم دووگیانییە رزگار دەبی، لە کاتی بروسکە و شریخەی هەورو باراندا هەوڵ بدە لە قاتی خـوارەوە بی. سڵاوی دایە مەرجان بگەیەنە و بەم هیوایە هەر چوارمان یەکتر ببینینەوە.